ڕۆبەرت سەنت یۆهن

# داود بنگۆریۆن

## دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسڕائیل

چاپێکی بژارکراو

وەرگێڕانی لە هۆڵەندییەوە:
شەفیقی حاجی خدر

داود بنگۆریۆن
دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل
نووسینی: ڕۆبەرت سەنت یۆهن
بابەت: یادەوەری
وەرگێرانی لە هۆڵەندییەوە: شەفیقی حاجی خدر
تایپ: وەرگێڕ
دیزاینی ناوەوە: کارژین خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
چاپی : دووەم/٢٠١٦
شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (١٠٠٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٢٤٤٥) ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.

## ئەم چاپە بژارکراوە

دوای بڵاوبوونەوەی چاپی یەکەم، کۆمەڵێ تێبینی و سەرنجم لە هەندێ خوێنەری بە سەلیقەوە دەربارەی چۆنیەتی چاپەکە و هەبوونی هەندێ هەڵەی چاپ و ڕێنووسەوە، پێگەیشتن.
لێرەدا ، نامەوێ پاساو بۆ کەموڕتییەکان بهێنمەوە، بەڵام ئەوەندە دەڵێم، کاتێ بۆ یەکەم جار کتێبەکەم چاپ کرد، نەوەک هەر پیتچنییەکە، بەڵکو ئەرکی چاپکردنەکەشی هەر لە ئەستۆی خۆم بوو، بۆیە لە چۆنایەتی کاغەز و چاپەکەیدا، هەوڵماندا کرێی تێچوونەکەی لەبەرچاو بگرین، قەبارەی لاپەڕەکانی کتێبەکە کەم بکرێتەوە و ژمارەی دێڕەکانی نێو هەر لاپەڕەیەک پتر و چڕتر بکرێنەوە، ئیدی کەموڕتییەکانی بە دوادا هات. ئەوکات چاویلکەی خوێندنەوەم بەکار نەدەهێنا، لێ کاتێ ئێستا کتێبەکە بەدەستەوە دەگرم، بەبێ چاویلکە بۆم ناخوێندرێتەوە!
هەرچۆنێک بێ، کتێبەکە بە کەموکورتییەکانیشیەوە، دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو، چونکە باسی دیرۆک و ئەزموونی گەلێکی زیندوو و مەزنە سەرکردایەتییێکی دڵسۆز و لێهاتووی وای دەکرد، کە جێپەنجەی دەستیان لەسەر مێژوو و جوگرافیای ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە زەقی دیارە.
بە سوپاسیشەوە کاتێ لەگەڵ کاک حەسەن عەلی (دەزگای ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە) قسەمان کرد، بە باشمان زانی ئەمجارەیان لە بەرگ و دیزاین و چۆنایەتییێکی نوێیدا چاپی بکەینەوە.
لێ، گەلۆ دەبێ ئەوەش بڵێم ، کاتی خۆی، کە کتێبەکەم کردە کوردی، ئەوکات دەسەڵام بەسەر زمانی ئینگلیزیدا نەدەشکا ، بۆیە لە هۆڵەندییەوە کردمە کوری، لێ ئەمجارەیان کاتێ بەسەریدا چوومەوە، وەرگێڕانەکەم بەدەر ئەوەی لەگەڵ دانە هۆڵەندییەیەکە، لەگەڵ ئینگلیزییەکەشدا بەراورد کرد، بۆ ئەوەی گەر هەر جۆرە لەنگییێک لە چاپی یەکەمدا هەبووبێ، لەم چاپە بژارکراوەیاندا نەمێنێ.

بۆ پێداچوونەوە و لێگرتنی هەڵەی چاپ و نۆژەنکردنەوەی ڕێنووسی کتێبەکە، ئەمجارەیان کاک کاروان عارف بە هانامەوە هات، کە بەڕاستی لەبن کۆڵی چاکەی دەرناچم. هەروەک چۆن جێپەنجەی لە کتێبی "یاخیبوون"دا دیارە، لێرەش بە سوپاسەوە ماندووبوونێکی زۆری کێشا. بەڕاستیش تێبینی و سەرنجەکانی ئەو، نەوەک هەر بۆ ئەم کتێبە بەسوود بوون، بەڵکو بەرچاوڕوونییێکیشن بۆ کاری داهاتووم.
ئیدی هیوادارم ئەم چاپە بژارکراوە، لە ئاست پەرۆشی خوێنەری بەڕێز دابێ، لە کتێبخانەی کوردیدا جێگەی خۆی بگری.

**ش.ح.خ**
**هەولێر، 28-07-2016**

## بەشی ١

پیاوە پرچ لە گرۆزە بۆزەکە زۆر بە زەحمەت خۆی وەرسووڕاند، تا لەسەر جێیەکەی پشت لەو کەسانە بکات کە لە ژووری نەخۆشخانەکەدا بەدیارییەوە وەستابوون.
دواتر یەکێک لە ئامادەبووان گوتی؛ ئەو بێدەنگییە بە وشەیەکی پیاوە لەسەر جێ کەوتووەکە شکێنرا، ئەویش دەربڕینی پەیڤی "نەحێمیا"[1] بوو.
بە گوێرەی ئەوانی دیکە ئەو هەر هیچی نەگوتبوو.
پاش ساتەوەختێکی دیکە، لە ژوورەکەدا دەنگی هەنسک هات. هەموویان بە شەرمەوە سەیری یەکدییان کرد. زۆربەیان ئەویان نەدیتبوو، هەست و سۆزەی وەها دەربڕێ، هەرچەندە یەک دووانێکیان لەبیریان بوو، کە ئەو نەوەک هەر پەشۆکا بەڵکو گریاش بوو، ئەمەش ئەو کاتی مامۆستاکەی بەرەو گۆڕ و دوامەنزڵگەی شۆڕکرایەوە.
ئیدی هەموویان یەک لە دوای یەک بە بێدەنگی ژوورەکەیان جێهێشت.
لە دواییدا ئەو هەر بە تەنها لەگەڵ خەمەکانیدا مایەوە.
برینەکانی باسک و لاقی بەهۆی ئەو پارچە پلاتینیانەی کە بە نەشتەرگەری تێگیرابوون، لە هیکرا بە ژان کەوتن. لێ ژانی دڵەکەی بە کوڵتربوو، چونکە دەیزانی کەسی دیکە لە دنیادا جێی نەحیمیای بۆ ناگرێتەوە. هەمووانیش ئەوەیان دەزانی. نەحیمیا خۆیشی دەیزانی. هەر لەبەر ئەوەش ئەوەی نەحیمیا کردبووی، لە سنووری تێگەیشتن بەدەر بوو.
دە ساڵ پێکەوە کاریان کرد. لە هەموو ئەو ساڵانەدا نەحیمیا وەک سایەی وابوو، هاوڕێیەکی متمانەدار، برادەرێکی لە یەک دانەبڕاو، هەموو کات ئامادەبوو گوێی لێبگرێ، هەمیشەش شادمان بوو کە

---

[1]Nehemia

بیتوانیبایە یارمەتی بدا. هەنووکەش بڕوا ناکرێ ئەو بۆ هەتاهەتایە لە پێش چاواندا ونبووبێ. ئاخر هەر ڕۆژی پێشتر- نەخێر چەند ڕۆژێک پێشتر- ئەو لێرە لەو ژوورە دانیشتبوو، تێبینی خۆی لەسەر نامەیەک بۆ دایبابی ئەو گەنجە دەردەبڕی، کە ئەوپەڕی توانای خۆی بەکارهێنا کە ببێتە پیاوکوژ. ئێستا ئەو ڕۆیشت. ئەرێ بۆچی خۆی لە ژیان بێبەری کرد، یان دەستی لە خۆی وەشاند و ژیانی لە خۆی تاراند، لە کاتێکدا لەو ڕۆژگارەدا ئەو زۆری پێویست پێبوو؟

ئەوان لەو دە ساڵ ژیانەی بە یەکەوەیان، ڕۆژانی زۆر کارایان هەبوو. بەڵکو ڕۆژانی ڕەش و تەنگانەی دیکەشیان لە بەردەمدا بووایە.

لە ڕاستیدا و لە ڕابردوودا نەحیمیا هیچ ڕۆڵێکی کارای لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا نەگێڕا، هەروەها لە ئایندەشدا دەبێ بەبێ ئەو کێشەکان چارەسەر بکەن. بەڵام ئەو بیرۆکەیە، تەنها ئەو بیرۆکەیە.. کە ئەو لەو نێوەدا نەماوە و چیدی ناتوانێ قسان بکا، بۆخۆی شت بوو...

ئەو پیاوە پرچ لوولە سپییە بە ویقارە چاوەکانی نوقاندن و یادەوەرییەکانی بۆ سەر ئەو حەفتا ساڵەی ژیانی گەڕانەوە.

سەرەتا و هەموو شتێک لە پلۆنسکەوە[1] دەستی پێکرد.

پلۆنسک لە سەردەمی قەراڵدا شاروچکەیەکی پیشەسازی بوو، کەوتبووە سەر ڕووباری هاوناوی خۆی، نزیکەی ٦٠ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای وارشۆ[2]وە دووربوو، هێڵی ئاسنینی بە دەریای بەلتیکی[3] دەبەستەوە. سەر لە زوو پلۆنسک سەر بە پۆلۆنیاوە بوو، لە دوایشدا هەر بۆی گەڕایەوە.

پینسک[4]یش ٣٠٠ کیلۆمەتر لە دووری ڕۆژهەڵاتی پلۆنسکەوە لە دیوەکەی دیکەی وارشۆوە هەڵکەوتبوو.

لە پلۆنسک، لە ڕۆژێکی زستانی شومی باوبۆرانی ١٨٨٦دا شایندال گریندا[5]، کە خانمێکی نەرمونیان و خۆشەویست بوو، تەمەنی لە ئاخر و ئۆخری ٢٠ ساڵییەوە بوو، شەشەمین کۆرپەی لە دایک بوو.

---

[1] Plonsk
[2] Warschau
[3] Baltic
[4] Pinsk

هەر لە هەمانساڵیشدا لە پینسک کوڕێکی لاوازی درێژ لە گوندێکی نزیکدا بەناوی حایم[7] وەک قوتابییەکی قۆناخی قوتابخانەی ناوەندی وەرگیرا.
شەشەمین منداڵی شایندال و ئاڤیگدۆر گرین [8]داود بنگۆریۆن[9]ی یەکەمین سەرۆوەزیری ئیسرائیل بوو.
ئەو مێرد منداڵەش کە حایمی ناوبوو، حایم وایزمەن[10]ی یەکەمین سەرۆکی دەوڵەتی ئیسرائیل بوو.
بە دەگمەن وایە لە مێژوودا دوو پیاوی لەیەک جودا بەم شێوەیە بە یەکدیەوە پەیوەست بن. بەڵێ هەردووکیان لە هەمان هەرێم لە دایکبوون، لە هەمان ڕۆژگاریشدا گەورەبوونە و بە هەوای هەمان ئاگریش خۆیان گەرم کردۆتەوە، بەڵام هەریەکە بە شێوازی تایبەتی خۆیانەوە، سەروکاری مژارێکی خۆنەویستانەیان کرد. گەر ئەوان کاتی خۆیان هاتبا، حەزیان لێبوو لەسەر خاکی ئیسرائیل بە دڵنیاییی سەربنێنەوە، گەر هاتبا و هەوڵوتەقەللای ئەوان نەبوایە، ڕەنگبایە لەو ڕۆژگارەدا ئەم ژیانە نوێیە لەسەر ئەم خاکەدا چەکەرەی نەکردبا.
داود بچوک و لەڕولاواز، کەچی کەللەسەری لە چاو باقی جەستەی گەورەتر بوو، هەر ئەوەش بووە مایەی خەمخواردنی دایکی و بردیە لای پزیشک، لەوەی پرسی ئاخۆ داود ئاساییە یان نا.
دکتۆرەکەش بەو شێوە وەڵامی دایەوە "پێویست بە خەمخواردن ناکا"، ئەوەش دوای ئەوەی بە وردی جەستەی داودی پشکنی، ئەوسا زیاتر لەسەری ڕۆیشت؛ "زارۆکەکە هیچی نییە، بەڵام من دەمەوێ پێشبینییەک بڵێم، ئەو گەورە دەبێ و پیاوێکی مەزنی لێ دەردەچێ. ئەوەش بە ئاشکرا لە پێوەری قەبارەی کەللە سەریدا دیارە."
لەوانەیە پێوەری قەبارەی کەللەسەر، پشکی لە هەڵکەوتنی داود بنگۆریۆندا هەبووبێ، بەڵام باوکی ئەو ئاڤیگدۆر گرین لەگەڵ ئەو دیمانەی پشکهەبووندا کارابوو، چونکە ئەو بەشی لە دروستبوونی

[6]Sheindal Green
[7]Chaim
[8]Avigdor Green
[9]David Ben-Gurion
[10]Chaim Weizmann

کوڕەکەیدا هەبوو، ئەوە بە ڕوونی دیار بوو، ئاخر ڕۆڵەکەی خۆی نایابانە پەروردە کرد و بە باشی پێیخوێند و ئامادەی ئەو ڕۆڵە کارایەی کرد، کە لە ژیانیدا گێڕای.
ئاڤیگدۆر گرین پارێزەرێکی بێ مۆڵەت بوو. پیاوێکی هۆشمەندی پلۆنسکیش بوو، زۆر لەو پێنج هەزار جوولەکەی شارۆچکەکە ڕاوێژی قانونیانەیان پێدەکرد. لە پاڵ ئەوەشدا، ئەو بەرهەڵستکارێک بوو، دوژمنەکانی ئەو تاوانی نائاسایانەیان ئەنجام دەدا. ئەو عەبای شۆڕی فڕێدا کە جلێکی نەریتیانەی جووە ئەرسەدۆکسەکانی پۆلنسک بوو. لە جیاتی عەبای دامەن شۆڕە، کراس و پانتۆڵێک هەندێ جارانیش شەپقەیەکی قیتی دەپۆشی. ناوبەناویش جگەرەی دەکێشا. هەروەها هەرچی پەیوەندی بە سمێڵ و ڕدێنیشەوە هەبوو، نەریتیانە نەدەجولایەوە. ئەو مەعمیلی غەیرە جووشی هەبوون. کتێبخانەکەی تەژی بوو لەو کتێبانەی ڕابینە خۆجیییەکان، کە دووریش بوون لە ئەرسەدۆکسێتی، نووسیبوویان. ئەو لەسەر ئەوە پێی دادەگرت کە داود و منداڵەکانی دیکەی عیبریەکی باش هەروەک زمانی ڕووسی فێر ببن.
بۆ پیاوە ئۆلدارەکانی پۆلنسک ئەوە کارێکی پیرۆزشکێن بوو، چونکە بە گوێرەی ئەوان زمانی عیبری تەنها بۆ سروود و بۆنە ئاینییەکان بەکاردەهێنرا. بە قسەی ئەوان ئەوەی لەگەڵ یەزداندا بئاخڤیبا، زمانی عیبری بەکار دەهێنا؛ بەڵام ئەوەی بەهاراتی بویستبا ئەوا دەبوایە بە زمانی یدیشی[11] بدوابا. باوکی داود وای لە منداڵەکانی کرد، بە وردی و بە قووڵی لە مێژووی ئینجیلی کۆن، جوگرافیای ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بکۆڵنەوە و بخوێنن. ئەو بەدوای قوتابخانەیەکی جووانە، کە تیایدا وەک خوێندکارێکی ئازادانە، خۆی بۆ خوێندنێکی جدیانە تەرخان بکا، دەگەڕا. جارێکیان لەپڕ هاوپۆلەکانی وەها سەرسام کرد، کە بڵێ "ڕۆژێک دێ من دەبمە سەرکردەی ئیسرائیل".
ئاڤیگدۆر گرینی باوک فەندەمەنتالێکی دینیی نەبوو تا کوڕەکەی لەسەر ڕێبازەکە ڕابێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵەکەی بە گیانێکی زایۆنیستیانە پەروەردەکرد. ئاڤیگدۆر گرین لە ناخەوە هەستی دەکرد کە بە خاکی باب و باپیرانیەوە بەستراوەتەوە. پلۆنسک مەڵبەندی

[11]Jiddisj

بزووتنەوەی زایۆنیزمی بوو لە بەشی ڕووسیادا، بۆ ئەو مەبەستەش کاروباری گرین زۆر پێویست بوو. لە هەمو ساتەکاندا بە ڕۆژ و بە شەو ماڵی گرین کە لە پایەتەختەوە نزیک بوو، جمەی دەهات و کۆبوونەوەی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی لێدەگیرا. لە ژووری خوێندنەکەیدا و لەسەر پرسە پەیوەندیدارەکانی زایۆنیزم گەرمەی گفتوگۆ و مشتومڕ و قسەی دووروودرێژی نەبڕاوە بوون. هەندێ جاران داود گوێی دەگرت. بەڵام ڕۆژانێک هەبوون، خۆی بۆ کتێبەکانی قوتابخانە و ئاینوئۆینەکانی گەمەی شەترەنج تەرخان دەکرد. بەهۆی ئەو گەمەوە داود گۆشەنیگای بەرەو یەک ئاراستە دەبرد و وای نەدەکرد مژاری دیکە لە چەقی بازنەی تێڕوانینەکەی لابدەن.

کاتێ داود تەمەنی گەیشتە ١٠ ساڵان، لە نەمسا شتێک ڕوویدا، کە باندۆرێکی گەورەی بەسەر ژیانی داود و تەواوی جوولەکەکانی جیهاندا هێنا. ڕۆژنامەیەکی ڤیەننایی ڕاپۆرتنووسێکی خۆی بە ناوی تیۆدۆر هێرتزل[12] ناردە پاریس، تا دەربارەی کاروباری سیخوڕیتی بکۆڵێتەوەو و وتار بنووسێ، ئەوەی شایانی باس بێ لەو گۆبەندەدا ئەفسەرێکی جوو بە ناوی دریفوس[13] تێوەگلابوو. هێرتزل کە بە خۆیشی جوولەکە بوو، پێشتر پەرۆشی زۆری خۆی بۆ زایۆنیزم دەرنەبڕیبوو، بەڵام کاتێ لە کێشەی دریفوسدا قوڵ بووەوە، سەروسەودای لەگەڵ پرسی دژە سامیزم پەیداکرد، ئەوسا نامیلکەیەکی سیاسیانەی لەژێر ناوی "***دەوڵەتی جوولەکە***"دا نووسی. تیایدا خوازیار بوو کۆتایی بە چەوساندنەوە و ڕاوەدوونانی جوولەکەکانی ئەورووپا بهێندرێ، ئەوەش لە کاتێکدا دەبێ، گەلی جوو وڵاتی خۆیان بکەوێتە دەست و هەموویان بۆ ئەوێ کۆچ بکەن و تیایدا جێگیر و نیشتەجێ بن. ئەو نامیلکەیە تەکانێکی نوێ بوو بۆ زایۆنیزم و تەوژمێکی بزوێنەرانەی دایە بزووتنەوەکە بەوەی:

**"هەر کاتێک ویستت پەیدابوو، ئیدی ئەوە خەون نییە."**

دوای پەیدابوونی هاوارنامەی هێرتزل، چەندین کۆنفرانس لە ماڵی گرین سازدران. ئەوسا بە دەنگی بەرزتر و گفتوگۆی زیاتر لەسەر ئەو باسوخواسانەدا کران. وتار بۆ ڕۆژنامەکان نووسران، بەشی نوێی

[12] Theodor Herzl
[13] Dreyfus

زایۆنیزم کرانەوە و کۆڕ و کۆبوونەوە سازدران. شەش زارۆک لەو دەیانەدا، کە شایندال هێنانیە سەر دنیا لە ژیاندا بوون، هێشتاش چاوەڕێی یانزەمینی دەکرد.
کاتێک تەمەنی داود گەیشتە دوانزە ساڵ، دوو ڕووداو قەومان، بە هۆیەوە ئاراستەی ژیانی داودیان گۆڕی. دایکی داود بە ژانی منداڵبوونەوە گیانی لەدەستدا و هێرتزلیش بانگەوازی بۆ هەموو جووانی دنیا کرد، کە لە بازلی سویسرا کۆببنەوە، لەوێ بە پەلە ڕێرەوێک بۆ بەرجەستەکردنی خەونی زایۆنیزم دابنێن و لەسەر زەمینی واقیعدا بیسەلمێنن.
بۆ مەرگی دایکی، داود مێردمنداڵێکی لاوازی هەستیار بوو، هەروەها هاوڕێشی کەم هەبوون. ئەو حەزی لە تەنیایی و گۆشەگیریی بوو. هەندێکیان پێیاندەگوت خەمگین و خاکیی. ئەو دەچووە سەر کەسایەتییە نەرموونیانەکەی دایکی. هەنووکە دەبێ باوکی سەرپەرشتی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی بکا. بەڵام ئەو بە مشوورخواردنی زارۆکە بچوکەکان، بزووتنەوەی زایۆنیزمی و کارەکەی وەک مافناسێک زۆر سەرقاڵ بوو. داود گەڕایەوە سەرخۆی، ئەو نەرمونیانەی لای داکی لەو ژینگەیەی تێیدا بوو، دادی نەدەدا. بەڵام لە ناخەوەی هەر بە دایکیەوە بەسترابووەوە. ڕەنگبێ داود هەر بە خۆیشی نەزانیبێ کە مردنی دایکی چ کۆستێکی گەورە بوو بۆی، بەڵام برادەرەکانی بە درێژایی ٦٠ ساڵ زۆر جاران لە نووسینەکانیدا، لە قسە و کۆڕەکانیدا، لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ژناندا شوێنەواری برینی مردنی دایکیان پێوەدەدی. زۆر جاران ئەوەیان لێ بەدیدەکرد، کە لە ژندا بە دوای دایک دەگەڕێ و دایکایەتیش هەمیشە بۆ ئەو هێمایەکی هەرە بایەخدار بوو.
کۆنفرانسەکەی بازل هەست و سۆزی زۆری وروژاند، تەنانەت لە نێو لاوەکانی پلۆنسکیشدا کاریگەریی خۆی هەبوو. ئەوە بۆ یەکەمین جار بوو دوای دوو هەزار ساڵ پەرلەمانێکی جوو کۆببێتەوە. بۆ یەکەمین جار بوو لەو سەدە دوور و درێژانەدا جوولەکەکان باسی گەڕانەوەی خۆیان بکەن، هەروەک ئەوەی بە ڕاستی نەخشە و پلانیان دانابێ و لایەنە بیردۆزیەکەیان بەلاوە نابێ. لە بازلدا باسوخواسی کردنەوەی زانکۆیەکی عیبری لە ئۆرشەلیمدا هاتە ناوناوان، باسی پێکهێنانی

فەندێکی نەتەوەییانەی جوولەکە و باسی بانکێکی جیهانی جوولەکە، کە بەرنامەی نیشتەجێبون و کۆلۆنەکانیان لە ئەستۆ بگرێ، کرا. هەر لەوێش پرۆژەی ئالآیەکی نەتەوەیی لەشین و سپی، رەنگەکانی دوگوردی سروتی نوێژەکانیان‌دانرا. خەڵک لەسەر سروودێکی عبریانە کۆک بوون، کە دەبووە سروودی وڵاتێک، هێشتا نیوسەدەی مابوو سەربەخۆیی خۆی جاڕ بدا. بەڵام گرنگترین بڕیاری کۆنفرانسەکە ڕاگەیاندنێکی ڕاشکاوانە بوو،بەوەی خەبات دەکەن بۆ "بەفەرمی ناساندن و زامنیەکی قانونیانەی ناوچەیەکی جوولەکە لە فەلەستیندا".
هەر جوولەکەیەک لەهەر گۆشەیەکی دنیادا بێ دەتوانی یەک شێکڵ[١٤]، یەک مارک، یەک شیلینگ یان چارەکە دۆلارێکی ئەمریکایی خۆی بدات و ببێتە ئەندام.
داود لە تەمەنی چوارده ساڵیدا هاوڕێ لەگەڵ گەنجەکانی دیکەی پلۆنسک بزووتنەوەی لاوانی زایۆنیزمیان پێکهێنا، بزووتنەوەکەیان بە ناوی ئێزرا[١٥] کە گەورەپیاوێکی ئۆلداری بابیل بوو، نا. ئەندامەکان دەبوایە سوێندیان خواردبا بەوەی لەگەڵ یەکدا بێجگە لە زمانی عیبری بە هیچ زمانێکی دیکە نەئاخڤن و خەباتیش بۆ بڵاوکردنەوەی کلتووری عیبری لەنێو کرێکارە گەنجەکاندا بکەن.
هەر زوو داود لەنێو ئەو بزووتنەوەیەدا ناوبانگی وەک وتاربێژ دەرکرد. بەتایبەتی هەڵوێستی توندی لە دوانەکانیدا دژی ئەو کەسانە بوو، کە بە توندی دژی بەکارهێنانی "زمانی کتێبە پیرۆزەکە" بوون لە ئاخاوتندا. ئیدی هەر زوو ناوبانگی بڵاو بووەوە، کاتێکیش تەمەنی گەیشتە پانزە ساڵ، یەکەمین دوانی لە کۆڕێک لە وارشۆدا دا. کەس بەبیری نایەتەوە ئاخۆ کتومت چی گوتووە، بەڵام ئەوانەی لە کۆنفرانسەکەدا بوون دەگێرنەوە، هەمووان لەژێر کاریگەری دوانەکەی ئەو کوڕە گەنجە پرچ ڕەشە لوولەییەدا بوون، کە تەختەی نێوچاوانی گەورە دیاربوو. ئەوکات بە تەواوی بە عیبری قسەی دەکرد، بە لێزانی و مشوورخۆری وتاری لەسەر زایۆنیزم دەدا و ئاماژەی زیندوویی پێدەدا.
یەکێک لە ڕابیە ناودارەکانی ئەوکات، ئەم تێبینیەی هەبوو:

[١٤] Shekel
[١٥] Ezra

"گەر دە لاوی وەک ئەوەمان هەبێ ئیسرائیل دەگەڕێنینەوە".
زۆر لە جوولەکەکانی ڕووسیا لەسەر ئەوە یەکانگیر بوون، کە ساڵی ۱۹۰۳ ساڵێک بوو لە یادەوەریدا بە نەمری دەمێنێتەوە، چونکە گڕکانی دژەسامیزم لەگەڵ خۆیدا تەقینەوەی دیکەی هێنا، کە دەرەنجامی کاریگەرییانەی لێکەوتەوە. لە شەقامەکانی شاری کیشنیڤ Kishinvی بیساری Bessarab دا تەرمی جووەکان لەسەر یەک کەڵەکە ببوون. کەس پێشبینی نەدەکرد ئاخۆ کەی تیرۆرەکە دەوەستێ. لە پلۆنسکدا جووەکان دەرکەی ماڵەکانیان کلۆم دا، هەر یەکێ بترسابا خۆی دەشاردەوە.
دوای وتوویژێکی دوورودرێژ داود و زۆرینەی هاوڕێکانی هاتنە سەر ئەو بڕوایە،بچنە ڕیزی پۆلای زایۆن Polaei Zion (بزووتنەوەی کرێکارانی زایۆن). لە ڕیزەکانی ئەو بزووتنەوەیەدا هاوشانی هاوڕێیانی دیکە خەبات بۆ گەڕاندنەوەی وڵاتی بەڵێنپیدراودا بکەن کە مافی هەمووانە.
لە هەمان ساڵدا درزێکی گەورە کەوتە بەر ئاکامی ئەو خەباتەی کە هەمیشە زایۆنیزم هەوڵی بۆ دەدا. خودی هێرتزلیش بۆ ئەو لە یەکترازانە دەستپێشخەر بوو. نەخشە و پلانی ئەوەی فەلەستین لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی بکڕێ، شکستی خوارد. ئیدی ئەو پەیوەندی بە پیاوێکی ئینگلیز کرد، ئەویش بیرۆکەیەکی هەبوو. یوسف چامبەرلاین Joseph Chamberlainی وەزیری کاروباری کۆلۆنەکانی بەریتانیا، لە کاتی شەڕی بورBoerدا گەشتێکی بە ئافریقادا کرد و پێشنیازێکی کرد، کە شەش هەزار مایلی چوارگۆشە لە بانە بەرزەکانی کینیا بۆ جوولەکەکان تەرخان بکرێ. ئەوکات هێرتزل دەوڵەتێک بۆ جووەکان لە ژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا دابمەزرێنێ. هەرچەندە هەرێمەکە نەدەکەوتە ئۆگەندا، بەڵام لەبەر هەر هۆیەک بێ پرۆژەکە بە ناوی نەخشەی ئۆگەندا ناوی دەرکرد. هێرتزل لە ۱۹۰۳دا ئەو پرۆژەی خستە بەردەم کۆنگرێسی جووان، کە بۆ شەشەمین جار بوو لە بازل دەبەسترا. ئەوکات هێرتزل بە جۆش و خرۆشەوە لە پشت پرۆژە پێشنیازکراوەکەدا بوو.

شتێکی دانسقە بوو کە جوولەکەکان دوای ١٨٣٣ ساڵ لە ژیانی ئاوارەیی هەندەراندا، بەو شێوەیە بیروڕایان دژی یەکدی بێ. خوازیارانی پلانی ئۆگەندا هەوڵیان دەدا بە شێوەیەک لە شێوەکان بڕوا بە نەیارەکانی دژی نەخشەکە بێنن، گوایە هەر کاتێ پلانەکە جێبەجێ بوو، ئەوسا ئامادەن لە ئافریقاوە لەشکرێک ئامادە بکەن و وڵاتی پیرۆز لە دەستی عەرەبەکان دەربهێنن. لەسەر ئەو مژارە تەنانەت لەنێو جووەکانی فەلەستینیشدا بیروڕاکان یەکانگیر نەبوون.

داود و هاوڕێکانی هەر لە بەراییەوە دژی پلانی ئۆگەندا بوون. بەلای ئەوان زایۆنیزم هەر واتای وەستانەوە و زامنی بوون دژی چەوساندنەوەی نەدەگەیاند. بۆ ئەوان ئەوەندە بەس نەبوو، هەر هەرێمێکیان لە دەرەوەی ئەوروپا بۆ مەیسەر بێ، کە تیایدا بە ئارامی بژین. زایۆنیزم واتای گەڕانەوە بوو بۆ وڵاتی کتێبەکە (مەبەست تەوڕاتە - وەرگێڕ)، بۆ وڵاتی باب و باپیرانیان کە بەچەندان سەدە پێشتر لەوێ وەدەرنرابوون. هەموو چیرۆکەکانی بایبل، هەموو پاڵەوان و ئەفسانەکانیان کە لەنێو گەلدا بە زیندویی ماونەتەوە، هەموویان شوێنپێیان لە فەلەستین بوو.

ئەوەی بۆ داود و هاوڕێکانی مایەی ئۆخەی و ئاهـ پێداهاتنەوەبوو، وەخراندن و دواخستنی کۆنگرەی بازل بوو، کە بڕیاربوو دۆزی پلانی ئۆگەندا یەکلا بکاتەوە.

کاتێکیش تەمەنی داود گەیشتە هەژدە ساڵ، بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی بەرەو وارشۆ بەڕێکەوت. لەوێ ئەو بەو بڕە پارە کەمەی کە باوکی بۆی دەنارد، لەگەڵ پارەی وانەوتنەوەکانی بە زمانی عیبری، دەژیا. ئەو ڕۆژگارە بۆ ئەو باڵکێشبوو. لە وارشۆدا وتاردەری جوولەکەی بەناووبانگ دەژیان و ئەویش گوێی لێدەگرتن.

لە بەرەبەیانێکیشدا لەپڕگیرا. هۆکارێکی ڕوونی قانونیانە بۆ گیرانەکەی لە ئارادا نەبوو. ئەو کارێکی وای نەکردبوو، کە بە هیچ کردەیەکی کەتن و تاوان تۆمەتبار بکرێ. بەڵام ئەوە نابێ لە بیربکرێ کە جوولەکە بوو، جوولەکەیەکی بزۆز. پرچە لوولە پەڕش و بڵاوە ڕەشەکەی بەرسڤی ئەوەی دەدایەوە، کە هێمای پلانگێڕانی سیاسیانەی بۆ پۆلیسە خۆجێیەکانی ئەوێ دەردەخست. بەو شێوە دەبوایە باجەکەی بدا.

داود ئەو ڕۆژە لە گرتوخانەکەدا مایەوە، ئێوارەش باوکی پەیدا بوو. ئاڤیگدۆر گرین بە خۆی و پاڵتۆ درێژەکەی و شەپقە قیتەکەی لە پلۆنسکەوە بە شەمەندەفەر هاتبوو. ئەو یەکەمین گەنجی جوو نەبوو، کە پارێزەر هەوڵی ئازادکردنی بدا. باوک کارتی خۆناساندنی دایە دەست پۆلیسی کاربەدەستی گرتوخانەکە. بەرپرسەکە دوای ئەوەی تەماشایەکی پێناسەکەی کرد و پرسی: "ناوت گرینە؟" لەسەری ڕۆیشت و گوتی "چ ڕێکەوتێکە منیش ناوم گرینە، ڤیکتۆر گرین".
لە سۆنگەی ئەو ڕێکەوتەدا، داود بێ ئەوەی لەبەردەم پێواژۆی دادوەریی و پۆلیسدا ئامادەبێ، ئازاد کرا.
سێ لاو لە پلۆنسک هەبوون، کە هەموو شتێکیان بە یەکەوە دەکرد: شلۆمۆ زێماخ Shlomo Zemach، کە دایک و باوکی بەپێی پێوەرەکانی شارەکە بە دەوڵەمەند دەژمێردران؛ شموئیل فوخ shmuel Fuch کە حەزی لە سەرچڵی بوو، سێهەمیشیان داود بوو. ئەوان دامەزرێنە سەرەتاییەکانی ڕێکخراوی گەنجانی ئەوێ بوون. بە یەکەوە لە ١٩٠٤دا شینیان بۆ مەرگی هێرتزل گێڕا. بە یەکەوەش نەخشەی ئایندەیان دادەنا. شموئیل یەکەمین کەسی سێکوچکەکە بوو، کۆچی کرد و ڕۆیشت؛ بەڵام ئەو نەچووە فەلەستین، بەڵکو بەرەو ئەمریکا تێیتەقاند. لە ئێوارەیەکی پاییزیشدا شلۆمۆ بە خۆی و ٣٠٠ ڕۆبلی باوکی، بێ پرسی خانەوادەکەی بزر بوو.
داود پێش ساڵرۆژی هەژدەمین بەهاری تەمەنی، وازی لە خوێندن هێنابوو، ئەمەش مایەی هەراسانکردنی باوکی بوو. ئەو بە پۆلۆنیادا دەگەڕا، لە هەر شوێنێک دەرفەت هەبووایە دوانی دەدا، هانی کرێکارانی دەدا یەکبگرن و سەرپەرشتی مانگرتنەکانیانی دەکرد، ئیدی زیاتر زایۆنیزمی لەگەڵ سۆشیالیزم ئاوێتە دەکرد. دوای کەمێک نامەی لە شلۆمۆی هاوڕێی پێگەیشت. دوهەمین شەپۆلی کۆچکردنAliyah دەستی پێکرد. پیاوان، ژنان و منداڵان بە لێشاو خۆیان گەیاندە فەلەستین. فەلەستینیش چیدیکە وڵاتی شیر و هەنگوین نەمابوو. بەشی هەرە زۆری کاری بێسەوادانە و نیمچە خوێندەواری لە فەلەستیندا لەلایەن عەرەبە خۆجێییەکانی ئەوێ بەڕێوە دەچوو، هەرچەندە گەر خاوەنکارەکانیش جوولەکە بوونایە. بەڵام ئەو بەچکە زێماخە Zemach،

ئیشۆکەیەکی لەوێ دەستکەوتبوو، بڕی خۆی بە نان و خورما دەشکاند. ئیدی ئەو لە نۆبەرەکان (پێشقەرەوڵەکان، مارەکان) بوو.
شلۆمۆ زامیخ جاریکیان گەڕایەوە پلۆنسک و ڕایگەیاند لە ماوەیەکی کورتدا دەگەڕێتەوە فەلەستین. ئەو گوتی: ژیان لەوێ قورسە، بەلام پڕ واتایە. ئەندامانی ڕێکخراوی گەنجان بە سەرنجڕاکێشانەوە گوییان بۆ هەڵخست، بەتایبەتیش کە دەربارەی وڵاتە دێرینەکە، دەربارەی بەدو (البدو، ڕەوەندەکان) کە بەشەو لە بیابانەوە بۆ تالان و برۆ دەهاتن، دەربارەی وشتر و مزگەوتەکان، دەربارەی گرد و زوورگەکانی دەوروبەری ئۆرشەلیم و دیواری سکالا، کە تاکە پاشماوەی دووەمین کۆتەڵەکە بوو، قسەی بۆ کردن.
داود هەر لەوێ ڕایگەیاند، ئامادەیە لەگەڵ شلۆمۆ هەرکاتێ بگەڕێتەوە، بڕواتە ئەوێ و ڕەنگبێ هەرگیزیش نەیەتەوە. باوک بە توندی ناڕازی بوو. باوکەکە پێی شەرمەزاری بوو، پێش ئەوەی گەنجێک خوێندنی تەواو بکا، پێواژۆی پەرەسەندنی ڕەوتی خوێندنی بقرتێنێ و بڕوا. گرین پیاوێکی زانا بوو، هیوای وابوو کوڕەکەشی وەک خۆی بێ. بەلام گەر هات و لە هیکەوە گەنجەکە بەڕووتوقوتی وەک کرێکارێکی کەرتی کشتوکاڵی گەیشتە سەر لمی فەلەستین، چی دەکا؟
نیو سەدە دواتر ئەو کەسەی ناوی داود گرین بوو، لە پلۆنسکەوەڕا هاتبوو، لە بەرانبەر کۆمەڵێ لە ڕۆژنامەوانە ئەمریکاییەکان وەستابوو، ئەو بەڵگەوبەندانەی دەهێنانەوە کە کاتی خۆی ببونە هاندەری تا ئەورووپا بەجێ بێڵێ. ئەو بەو شێوە قسەکانی دارشتن:
"من پەنابەر نەبووم، من بۆ ئەوە نەهاتبووم کە ڕاوەدوو دەنرام... لە منداڵییەوە، لە تەمەنی پێنج ساڵیدا هەستم کرد پۆلینیای جێ ژیانی من، ماڵ و نیشتمانی من نییە. من هەستم کرد ڕۆژێ دادێ ئەم وڵاتە، ئیسرائیل دەبێتە وڵاتی باوانم. ئیسرائیل دیرۆکێکی چوار هەزار ساڵەی هەیە، ئەوەش ڕەگوڕیشەی لە ناخەوەی گەلەکەمان دارشتووە. ئەوەش دۆزێک نییە هەر تەنها بە چەوساندنەوە گرێدراو بێ، بەڵکو پەیوەندی بە پێویستی ئۆلییەوە هەیە".
داود تەماشایەکی سەروچاوی ڕۆژنامەوان و ڕادیۆکارانی کرد و بە پەلە بە ڕوویاندا مسکە بووە و لەسەری ڕۆیشت:

"من زۆر لەوە دڵنیا نیم، کە ئەو ١٠٢ کەسەی لەگەڵ "گوڵەکەم" My flower (ناوی کەشتیەکە بوو) هاتنە وڵاتەکەتان، پەنابەر بووبن. ئەوان دەیانەویست لە وڵاتێکی نوێدا دەوڵەتێکی ئازادانە ڕۆ بنێن. هەر ئاواش زۆر لە خەڵکی ئێمە هاتنە ئێرە بێ ئەوەی ڕاوبنرێن. ئەوان بەپێی هێزی ڕاکێشەری ڕۆحی هاتن: بۆ ئەوەی ئازادانە و بێ لەمپەر، دینی جوولەکایەتی خۆیان لەم وڵاتە دەوڵەمەندەدا پەیڕەو بکەن. ئەمەش بۆ ئێمە واتایەکی زۆروزەوەند دەگەیەنێ".

## بەشی ٢

دوو گەنج ماندو و شەکەت لەسەر پشتی کەشتییکی بارهەڵگری ڕووسی، لە ئۆدێسیا Odessa بەرەو دەریای ڕەش، لەوێشەوە لە ڕێی دارندێلن Darendellenەوە گەیشتنە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست.
هەر دوو لاوەکە گرەویان لەسەر ئەوە کردبوو، ئاخۆ کامەیان پێشتر وڵاتی مەبەست دەبینێ، هەر بۆیەشە چاویان لەسەر ئاسۆ هەڵنەدەگرت. گەشتەکەیان چەندان هەفتەی خایاند. ئێستا پلۆنسک زۆر لە پشتی ئەوانە و خواحافیزیان لە ژیانی ئەوێ کرد.
"داود، داود تەماشاکە، تەماشاکە گەیشتین، تیژ بڕوانە، بە درێژایی تەمومژەکە بە لای چەپەوە، ئا لەوێیە، ئەوێ یافا jaffaیە".
داود زۆر بە وردی لێی دەڕوانی تا لە دواییدا شوێنەکەی دی. گەلۆ پەڵەیەکی بۆر کە هەوا و ئاو بە یەک گەیشتوون، بەڵێ ئەوە بوو وڵاتی بەڵێنپێدراو، وڵاتەکەی خۆی. ئەو جوویکی ئاوارە بوو، ئیدی لە دواییدا گەڕایەوە زێدی باب و باپیرانی. بۆ ئەو ئاوارەبوون، کە نزیکەی دوو هەزار ساڵی خایاندووە، کۆتایی هات. لەمە بەدوا ئەو لێرەدا دەژی و دەمرێ. لێرەوە خەبات بۆ بەدیهێنانی خەونی خۆی و هی ئەوانی دیکە دەکا. بەرەو دواوە بە لامل ئاوڕێکی لە بەلەمەکە دایەوە. تا چاوبڕی دەکرد هەر ئاسۆ بوو، زێیەکی شین شین. بەڵام لەبەر خۆیەوە دەیگوت؛ ڕۆژێک دادێ زێیەکە لەبەر پڕی ئەو بەلەم و کەشتیانەی کە ئاوارەکان دەگەڕێننەوەماڵی خۆیان، ڕەش هەڵبگەڕێ.
هەنووکە کەشتیەکە نزیکتر بۆتەوە، توانیان خانوو و خەڵک لەیەک جیابکەنەوە. یافا شارێکی دیرۆکیی بوو. لە کتێبەکەدا (مەبەست تەوراتە)

نووسراوە: تیرەی دان Dan لێرەدا جێگیر ببوون. ئاخر خۆ نزیکەی هەموو بەشێکی ئەم ناوچەیە رۆڵی خۆی لە مێژوی جوواندا بینیوە. بایبل (تەورات) ناوی هەمووانی بردووە. داود زۆر بەوە دڵشاد بوو، کە باوکی جوگرافیا و مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەراستی فێرکردبوو. ئەو دەیزانی بەلەمەکەی یونس Jounas لە نزیک یافاوە کە خودی پێغەمبەری لەسەر پشت بوو، خەریک بوو نقوم بێ، کە نەهەنگێک هات و قوتی دا. دواتر لێرەدا کارەساتگەلی چەوساندنەوە و راوەدوونانی ترسناک قەومان. کاتێکیش کۆتەڵی دووەم رۆخێندرا، بە هەزاران جوو لە لایەن شوێنکەوتووانی گریکەوە بە لیست بەرەو بەندەرەکە بردران و خنکێندران.
هەرچەندە هەموو ئەو شتگەلە مێژوییانەی بەیاددا دەهاتەوە، هەستی بە بێئومێدی دەکرد. کاتێکیش یافایان بە تەواوی لێدەرکەوت، شوێنەکەیان وەک ئەو دە بەندەرەکەی دیکە هاتە بەرچاوان.
تۆ بڵێی چەندان نامرادی دیکەیان چاوەرێ بکا؟
ئایا کاتێک لەگەڵ راستیدا رووبەروو دەبێتەوە، کۆپلەی خەونەکانی هەموو شتێکی لە بیر دەباتەوە؟
کاتێکیش لە کەشتییەکە دابەزین، یەکێ لە هاوگەشتەکەیان بەسەر زەویدا داکەوت و هەردوو چنگی هیستریایانە لە لم گیر کرد و ماچی کرد.
داود هەستی بە پەشۆکان کرد. بە راستی ئێرە جیهانێکی سەیر و نامۆیە، بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ گریمانەی مێشکیدا یەک ناگرێتەوە. شەقامەکان لە عەرەبی دشداشە سپی پۆش جمەیان دێ. هەوای یافا بۆ کەپوویەکی هەستیاری پیاوێکی ئەورووپایی زەحمەت بوو. لێرەدا خەڵک بە زمانێک قسەیان دەکرد کە لە یەکنزیکییکی تەومژاوی لەگەڵ عیبریدا هەبوو، داود لێی تێنەدەگەیشت. بەڵام ناوبەناو دوو پیادە تێدەپەرین کە بە یدیشی دەئاخفین.
لە میوانخانەیەکی هەژاری بێسەروبەر، کە ناوی میوانخانەی حایم باروخ Caim Baruch بوو، لەگەڵ یەکێ لە کارگێرانی بزووتنەوەی کرێکارانی زایۆنی، کە پێشتر بە هاتنی داودیان زانیبوو، بەیەکەوە لەسەر خاکی وڵاتە دێرینەکە ژەمێکیان خوارد.

هەموویان بە یەک دەنگ لە کاتی پێکهەڵدانی پێکی شەرابی شیرینی فەلەستینی پەیڤی لێهایم lehayimـیان دەربڕی. ئەوەش پێکهەڵدانێکی نەریتیانەی عیبریانە بوو واتای -بەخۆشی ژیانت-ی دەگەیاند.
ئەو شەوە گەنجەکان چوونە پیتاخ تیکڤاه Petach Tikvahی کۆنترین نشینگەی (کۆلۆن)ی فەلەستینی. ئەو شوێنە پێش هەشت ساڵبەر لە لەدایکبوونی داودەوە دروست کرابوو، هەر بۆیە بە دایکی هەموو نشینگەکان دەناسرا. نشینگەکە بە دەستپێکی زانا ئۆلدارەکانی ئۆرشەلیم کە زۆربەیان لە هەنگاریاوە هاتبوون، دامەزرا بوو. پیاوە دروستکەرەکان ڕاوێژی پزیشکێکی گریکیان سەبارەت بە نەگونجاوی دیارکردنی شوێنی نشینگەکە بەلاوە نابوو.
سەیرکەن، دکتۆرەکە پێیگوتبوون؛ "تەنانەت مەلەکانیش لێرە بۆ کرم و مێشومەگەز نانیشنەوە. دەزانن بۆ؟ چونکە هەواکەی پیس و بۆگەنە".
لەگەڵ ئەوەشدا نشینگەیەکی قشت و سەرنجراکێشی لێ دروستبوو. ڕیزە خانووی ڕێکوپێک، هەندێکیان لە دار و ئەوانی دیکەش لە لگبن (خشت)ی قوڕ دروست کرابوون. لە سۆنگەی کۆمەک و باربووە زۆرەکەی بارۆن ئیدمۆند ڕۆتشیلد baron Edmond de Rothschildی پاریسنشین، ڕێگاکانیان بە داری بەرزی کالیپتۆز و دەروپشتیشیان بە ڕەزوباخ داچاندبوو. بەلام لە هەمووشیان گرنگتر ئەوە بوو، لێرەدا جوولەکە دەژیان، ئەو جووانە کاتی خۆیان بە چایخانە نەدەکوشت و کشتکاری وجوتیارییان بۆ حیسابی خەڵکی دیکە نەدەکرد. لێرەدا جوو لەسەر خاکەکەی بە سەرکەوتووانە تێدەکۆشان.
داود گرین لە ژیانی ئایندەی خۆیدا تا کۆتایی، بە توندی داکۆکی لەو گریمانەیەی دەکرد، کە گەڕانەوە بۆ زایۆن، ئاوەدانکردنەوەی ئیسرائیل و ڕزگارکردنی جووەکان، ئەو کاتە ئاسان دەبێ، کە جووەکانی دیاسپۆرا دەستبەرداری شێوەژیانی هەندەرانیانەیان ببن. کاری دەستی پێویستە لە ویژدانەوە هەڵبقوڵێ. کۆچبەرەکان لەسەریانە پیشەی کشتوکاڵی بگرنەبەر.
کاتێک گەنجەکانی پلۆنسک دوای گەشتە دووروودرێژەکە گەیشتنەجێ، ماندو و شپرزە ببوون. بەڵام داود شەوەکەی خەو نەچووە چاوانی. لەو کاتەیدا گوێی لە دەنگە کپبووەکانی بیابان کە دەوروبەری نشینگەکەیانی

گرتبوو، دەگرت؛ چەندان جۆرە پلان لە مێشکیدا گینگڵیان دەخوارد. "ئاخر کێ دەتوانێ لە شەوی یەکەمی گەیشتنی بە زێدی باب و باپیرانی بە خەو بباتەسەر". ئا بەو شێوەیەی سەروو پرسێکی ئەندێشاوی سەرهەڵدراو لە یەکەم نامەی بۆ باوکی نووسیبوو. پاشان کە یادی نشینگەی پێتاخ تیکڤاهی دەکردەوە دەیگوت: "بیرۆکە و کەڵکەڵەی سەری منداڵیم و خەونەکانم هاتنەدی، ئەزیش پێی شادمان بووم. ئێستا من لە وڵاتی ئیسرائیل دام، لە گوندێکی جوولەکاندا دەژیم ، ناوی "دەروازەی هیوا"یە".

- "من بۆنی گەنمەشامی دەکەم، گوێم لە زەرینی کەر و هاشوهوشی گەڵای ڕەز و باخەکانە. لە سەرووی خۆمەوە پۆلێک ئەستێرە دەبینم، کە ڕوون و چراخانن و دڕ بە تاریکی شەوەزەنگ دەدەن. دڵم لە بەختیاریدا لێدەدا، وەک ئەوەی هاتبمە نێو ماڵی خەونەکانم، بە ڕاستیش خەونەکانم هاتنەدی".

ڕۆژی دواتر داود و شلۆمۆی هاوڕێی دەرکەوتن و بەدوای ئیشێکدا دەگەڕان. ماندو و شەکەت لهم کێڵگەی جوو بۆ ئەوی دیکە، ئەوان ئامادەیی خۆیان بۆ هەر کارێک دەربڕی و داخوازیشیان کرێ و مزی زۆر نەبوو. بەڵام لە هەموو شوێنێکدا هەر هەمان وەڵامی نەرێیانەیان وەردەگرتەوە. "جوتیارسالارەکان" وەک داود دواتر بۆ گاڵتەپێکردن ناوی لێنان، پێیان خۆشتر بوو کشتکارە عەرەبەکان بخەنەگەڕ. چونکە دەستی کاری عەرەب هەرزانتر بوو. عەرەبەکان ئەزموونیان هەبوو. گوایە گەنجە ئایدیالیستە جووەکان توندوبەند نین. ئەوان دەستیان قەلش و زبر نییە. ئەوان ئەو پیاوە نین خۆیان لەبەر تاوی سوتێنەری هاوینی بیابان ڕابگرن. جوتیارە جووەکان دەیانتوانی باشتر جڵەوی کرێگرتە عەرەبەکان بگرن. گەنج و تۆلازە دلێرەکانی جوو، زیاتر بۆ بانگەشە نەوەک کارکردن دەستدەدەن.

ئەزموونی پێتاخ تیکڤیاه بە قووڵی باندۆری خۆی لەسەر کەسایەتی و گریمانە سیاسیانەکەی داود گریندا دانا. ئەو لە ناخەوە قینی لە دەوڵەمەندە جووەکان هەڵگرت. ئەوانی بەوە تۆمەتبار دەکرد، گوایە وڵاتی پیرۆز دەکەنە بەهەشتی تاوان و تاڵانکاران.

لە دواییدا داود و شلۆمۆ کارێکیان بە هەشت پیستەر (پارەی ئەوکات) لە هەفتەیەکدا دەستکەوت. مزەکەیان بە ئاستەم بەشی بە کرێگرتنی پێخەفێکی شەو و ژەمە خواردنێکی ئێواران دەکرد.

داود ساڵێکی بەو کولەمەرگیە لە جودا Judeaدا بردەسەر. ئەو لەسەر ئیشەکەی ڕانەهات. لەبەر ئەوەی تێری بە زگی خۆی نەدەخوارد، کز و زەبوون هەڵگەڕا. کاتێکیش تووشی مەلاریا بوو، بەم شێوەیە گێڕایەوە:

- "هەرسێکیان، ئیش، برسێتی و مەلاریا بۆ من ئەزموونی نوێ بوون. لە ماوەی چوارده ڕۆژدا لەگەڵ لێدانی کاتژمێر، تام دەگرت، ڕۆژێک تا شەش ڕۆژانی دەخایاند و دواتر نەدەما.

برسێتیش میوانی هەمیشەییمان بوو. بە هەفتە، هەندێ جارانیش بە مانگان پڕ بە زگم نەدەخوارد. بە ڕۆژ دەکرا ئارام بگرم و زۆر بیری لێنەکەمەوە، بەڵام شەوان ژانی برسێتی بە سەعات بەری نەدەدام، هەناوی لوول دەدام، بەرچاوی تەنگ دەکردم، هەناوی دەگوشیم، لەنێو مۆخی ئێسقانەکانمدا ئازارێک سەرتاپای جەستەمی دادەگرت. ئیدی بە ناچاری لە کۆتاییدا خەوێکی شەپرێو دایدەگرتم."

بە درێژایی ساڵی یەکەمی، هەندێک کات لە ڕەز و باخی شەڕاب و ژێرزەمینی شەڕاب دروستکردنی ڕیشۆن زایۆن RishonZione کە خاوەنەکەی بارۆنی ناودار ریتشێلد بوو، کە بە ملیۆنان دۆلاری لە ئیسرائیل وەبەردەهێنا، کاری دەکرد. ئەنجا ڕووەو گوندێکی نوێی کفر سەبعە Kfar Saba بەڕێکەوت. جارێکیان لە نامەیەکدا بۆ باوکی نووسیبووی: " ئێمە لەسەر گردێک دەژین کە بە چیا دەورەدراوە. هەوا لێرە سازگارتر و تەندروستترە. ناوچەکە بە داری تو چێندراوە، کە بەر لە ساڵێک لە عەرەبەکانیان کڕیوەتەوە. هێشتا خانووی لێ دروست نەکراوە. پاشای نابلوس Nablus کە دەسەڵاتداری سەر ئێرەیە، تەنها بە پارە لێدەگەڕێ لایەکان خانوو دروست بکەن. نرخی زەویەکان بەرەبەرە بەرز دەبێتەوە. ئێمە بەرەبەیانیان لە سەعات شەشەوە بۆ سەر کار دەڕۆین، لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕۆژیش ئارەقە لە لەشمان وەک ئاو جۆگەلە دەکا و دێتەخوار".

داود لە وتار و دوانەکانیدا بە ئاشکرا تووڕەبوونی خۆی بەرانبەر ئەو جووانەی ترسنۆک بوون، ئەوانەی کەمتر مەیلیان بە لای سەرچڵێتیدا

دەرۆیشت، ئەوانەی خۆیان پەرگیرکردبوو لە بەرانبەر گەڕانەوەیان بۆ فەلەستین، دەردەبڕی. دەنگی ئەو سکالایەی تا لە ژیاندا بوو، کپ نەبوو.

- "لەسەر پشتی هەر کەشتییەک کە بۆ ئێرە دێ، پڕی گەشتیارە، بۆ کارانگازبوون بە جوانی وڵاتدا دەگەڕێن، بەڵام هیچ جوولەکەیان لەگەڵدانین. خەڵکی ئێمە هەر بەوەندە لێگەڕاوە کە ڕۆژێ سێ جاران نوێژ بۆ ئیسرائیل بکەن و بۆی بپاڕێنەوە. لە ڕۆماکاسۆلیک دەژین، کەچی لە زایۆندا هیچ زایۆنیستێک ناژی."

ساڵێک دوای گەیشتنی داود، کۆنگرەیەکی بزووتنەوەی کرێکاری زایۆنیزمی لە فەلەستیندا سازدرا. هەندێک لە شاندی ئامادەبوو ڕایانگەیاند کە ٧٢ کیلۆمەتری نێوان ئۆرشەلیم و یافایان بە پێ بڕیوە. یەکێ لە کارگێڕانی کۆنگرەکە گەنجێک بوو، هەر دوو ساڵان لە داود گەورەتر بوو، ئەویش ئیسحاق شیمشەلیڤیتش Itzhak Shimshelevitch بوو، کە زۆر نەبوو لە ئۆکرانیای ڕووسیاوە گەیشتبووە فەلەستین. ئەو کابرایەکی لاوازی ڕوو بەیەکداقوپاوە بوو. لە ڕووسیادا بەشداری بزووتنەوەی بەرگری لەسەرخۆکردنەوەی جوان بوو، کاتێکیش ماڵیان پشکنیوە، برێکی زۆری چەک و تەقەمەنی شاردراوەیان لە ماڵدا دۆزیوەتەوە. لە کاتێکدا ئەو لە ماڵ نەبووە پۆلیسی ڕووسی ماڵ بە ماڵی پشکنیەوە، لەسەر دۆزینەوەی چەکەکان تەواوی ماڵباتەکەیان گرتووە. ئیدی دایکی، باوکی و تەواوی منداڵەکانیان بۆ سیبیریان نەفی کردوون. ئیسحاق لەوە سەرکەوتوبوو خۆی لە چنگی پۆلیسەکان دەرباز بکا و بەرەو فەلەستین هەڵبێ. کاتێکیش ناوی خۆی لە تۆماری میوانخانەی یافادا تۆمار دەکرد، لەژێر ناوی بن زیڤی Beni Zivi ئیمزای کرد و پاشانیش بە فەرمی هەر ئەو ناوەی بەکارهێنا.

داود، هەواداریتی خۆی بۆ ئەو لاوە ئۆکراینیە نەشاردەوە، لە زۆر پرسی سیاسیدا خۆی و بن زیڤی هاوڕابوون.

هەرچەندە داود بەهرەی زمانزانینی نەبوو، بەڵام لە ڕێی خولی چڕوپڕدا فێرە زمانی عەرەبی بوو. هەنووکە ئەو چوار زمان دەزانێ، ڕووسی، یدیشی، عیبری و عەرەبی، هەروەها لەگەڵ هەندێ پۆلۆنیش. لە ماوەی

ساڵی یەکەمی لە جودا Judeaدا بە چڕی خەریکی لێکۆڵینەوەی جوگرافیای ناوچەکە بوو. ئەو هەموو گوندێک، هەموو دووڕیان و چوارڕیانێ، هەموو ڕووبارە وشکهەڵگەڕاوەکانی دەناسی. بەڵام خۆی و شلۆمۆی هاوڕێی چیدی خولیای کاری کرێگرتەیی کشتکاریان لە جودیادا نەمابوو.

دواتر داود وا دەنووسێ:

- "چیدیکە کاری لەبن نەهاتوی تەور و بێڵ ڕزگارم ناکا. کارەکە ماشێن ئاساییە. هەڵکەندنی خاک، وام لێدەکا بیر لە کاری فابریکیانە بکەمەوە. من تامەزرۆی ئاسۆیەکی بەرفراوانم، تامەزرۆی خۆڕاوەشاندنی قەدی گەنمەشامیم، تامەزرۆی بۆن و بەرامەی گیا و گۆرانی دروێنەم؛ بۆیە بڕیارمدا بەرەو باکوور بەرەو گالیلیا Galila هەڵبکشێم".

داود گرین شوێن خەونی خۆی لە شێجیرا Sejera دیتەوە. خۆی و دە کەسی دیکە هەموو نێوانەکەیان کە نزیکەی ۱۰۰ کیلۆمەتر دەبوو لە پیتاخ تیکڤاهەوە تا باکوور بە پێ بڕی. لە ڕێگەیاندا بە بیاباندا دەڕۆیشتن، زۆر گوندی عەرەبانیان دەهاتەڕێ، بە گردەکانی جودیادا تێپەڕدەبوون، وردە وردە لە باکوور نزیک دەبوونەوە، بە ئاراستەی ڕۆژهەڵاتدا ڕوەو گۆمی تەبەریا بایاندایەوە.

بە ڕاستی شێرجیا دەڤەرێکی جوان بوو. ناوچەکە بە شاخان دەورەدرابوو. نشینگەگە لە لاپاڵی گردەکە هەڵکەوتبوو، ڕیزە خانووێک لەوی دیکە بەرزتر بوو. پڕ داروبار بوو. لێرە دەتوانێ ڕەنج بدا و تۆو بچێنێ، لێرە هەر لەبەر ئەوەی جوولەکەیە، کەس ڕێگای کارکردنی پێناگرێ.

پاشان داود ڕایگەیاند؛ لەو شوێنەدا و بۆ یەکەمین جار هەستی بەوە کردووە، کە لە ماڵ وحاڵی خۆیەتی. ئیدی ئەوەیە وڵاتی باو و باپیرانی کە زۆر تامەزرۆی دیتنی بوو.

داود ئاوا بۆ باوکی دەنووسێ:

- "بە دەستی چەپەم ئامورم پێیە و بەدەستی ڕاستەش زەختەی گا هاژۆتن، ئەوەم بۆ دەردەکەوێ کە چۆن خاک هەڵدەکێڵم و گیاوگۆڵی لێ بژار دەکەم، هەروەک ئەوە وایە جووتە گایەکە

بـرادەرم بـن و ناوبـەناو هـەقی پشـوودانیان پێـدەدەم. لێـرە ئەوکاتـەم هەیـە بیـر بکەمـەوە و نەخشـە و پلانـی خەونـەکانم دابڕێژم".

کاتێ داود دەیەویست ڕوونی بکاتەوە کە بۆچی لە شیجیا بەختەوەر بووە، دەڵێ:

- "لێرەدا هیچ دوکاندارێک، هیچ بازرگانێک، هیچ کرێگرتەیەکی غەیرە جوو، هیچ کەسێک بەسەر زگی ئەوی دیکەدا باز نادا. پیاوان زەوی دەکێڵن، وەرد و شۆی دەکەن و تۆوی پێدادەکەن، ژنـانیش لـە باخچـەکانـدا گیـا دەڕنـن و مانگاکـان دەدۆشـن؛ منداڵەکانیش قازەوانی دەکەن و یارمەتی باوکیان دەدەن. ئەوانە بـە ڕاسـتی لادێیـەکانن، کـە بـۆنی تەندروسـتی پـەین و گـەنمی پێگەیشتویان لێدێ و پێستیشیان لەبەر تین و تاوی ڕۆژ ڕەش هەڵگەڕاوە".
- سـەر لـەنوێ خۆناسـینی کۆچبـەرەکان دەسـتی پێکـردەوە. ئـەو پێواژۆیـەش دەبـێ خـولی خـۆی تـەواو بکـا تـا لـە هەمـوو لایـەک جوتیارە جووەکان خاکەکە بە میوەجات بەرهەم بهێنن، هەروەک ئـەو ڕۆژگـارەی، کـە هێشـتا جـوو پەرشـوبڵاوی وڵاتـان نەبووبوون.
- گەر هاتوو دواتر لەم وڵاتەوە جارێکی دیکە دەرکراین و پەڕینە وڵاتێکی ئـەودیوی زێ، ئـەوکات یادەوەرییـە گاڵتەپێنـەکراوەکانی شـەوەکانی ئێرە، کـە نیشـانەی ڕەوای لـە دایکبونـەوەی گەلێکـە، هەرگیز لەبیر ناکەین و لەگەڵ خۆمدا دەیانبەم".

ئـەو وشـانەی سـەرو هـی دەربـەدەرێکی جـوو بـوون کـە لـە دوایـدا گەڕابووەوە. ئەو بۆ باوکی خۆی ئاشکراکرد گەر هاتوو جارێکی دیکە لەلایـەن، ترکـەکان یـان عەرەبـەکان وەک نـەوەکانی پـێش خـۆی دەربەدەرکرایەوە، ئەوا هەرهیچ نـەبێ بایی ئەوەندە لە وڵات ژیاوە، کە یادەوەرییـە نـەمرەکانی بەتایبـەتی هـی شـەوە لەبیرنـەچووەکان، لەگـەڵ خۆی بێنیتەوە.

لە هەندێ بەشی فەلەستیندا عەرەبەکان کۆچی جووەکانیان بە قازانج حیساب دەکرد. چونکە دەرفەتی کار زێدەتر دەبوو، کرێ و مز باشتر دەبوو و داودەرمان و چارەسەریش چاکتری لێدەهات.
بەڵام لە گالیلیا عەرەبەکان هێشتا هەر وایان بیردەکردەوە، دەکرێ جووەکان لە ڕێی تەنگەتاوکردن دەربکرێن: گەرهاتوو خانووماڵیان بسوتێندرێ، مەڕو ماڵاتیان بدزرێ و پەلاماری پیادەکانیان بدرێ، ئەوا لەو ناوەدا نامێنن. لە گوندەکانی دەوروبەری شێجیا هۆزە عەرەبەکان ئەزموونێکی زۆریان لە تاکتیکی تۆقاندندا هەبوو، چونکە بەهایان بۆ ژیانی مرۆڤ دانەدەنا. بۆیە پێویست بوو نشینگەکان ئێشگریان هەبێ. هەرچەندە لەو دەڤەرەدا بە تەواوی جوولەکە ئێشیان دەکرد، بەڵام ئەوانەی بە شەو ئێشکگریان دەکرد، عەرەبە کرێگرتەکان بوون، ئەوان عەرەبی سیرکاشیر Circaaiers کە لە گوندی عەرەبانی کفر کانا Kfar Kana وە هاتبوون، بە پارەیەکی زۆر ئەو کارەیان دەکرد.
بۆ ئەو سیستەمەش ڕونکردنەوەی جۆراوجۆر هەبوون. گەر هاتوو مرۆڤ عەرەبەکانی هۆزێکی دژواری وەک سیرکاشیر بەکرێ بگرێ و ئێشکی شەوانەیان پێبگرێ، ئەوا بەلای کەمییەوە شەوانە کردەی بەسەردادان ڕوونادەن. ئەوجا وەک دەگوترێ "بە دز دز دەگیرێ".
سەرباری ئەوەش جووەکان سەردەمانێکی دوورودرێژە چەکیان هەڵنەگرتووە. دەکرێ کاری کشتوکاڵی بکەن، بەڵام کاری سەربازی بۆ ئەوان نەشیاوە.
داود کە ماوەیەکی کەم بوو گەیشتبووە شێرجیا، خوازیاربوو سەرپەرشتی هەڵمەتێکی گۆڕان بکا. وڵاتی جووان دەبێ هەر لەلای خۆیانەوە پاسەوانی بکرێ. ئەوەش دروشمی ئەو بوو، خەباتی بۆ کرد تا بووە سەرەداوی بنەمایەک و دواتر بە بنەمای کرێکارانی زایۆنزمەوە ناسرایەوە.
لە ڕاستیدا سەبارەت بەو دۆزە، ئەو ڕووبەڕووی نەیارانی زۆر بووەوە. دەسەڵاتدارە خۆجێیەکان سەری ڕەزامەندییان بۆ ئەو داخوازییەی نەدەلەقاند. گەر هاتو جووەکان خۆیان پاسەوانی لە خۆیان بکەن، ئەوا هەندێ هۆزی عەرەبی بەرەنگاریان دەبنەوە. کەسیش پێشبینی نەدەکرد، دواتر ڕەوتەکە بەچی دەگەیشت. گەر هاتوو هۆزی سیرکاشیر لەسەر

کاری پاسەوانی دەربکرێ، بێ گومان دەرەنجامی سوتاندن، کوشتن و تالآنوبرۆی لێدەکەوێتەوە.
داود و هاورێکانی چەند شەوێک نەنوستن تا بۆیان دەرکەوت، کە پاسەوانەکان کاری ئێشگرێتی خۆیان بە باشی نابەنەسەر. پاسەوانەکان ئاهەنگێکیان لە گوندێکی عەرەبانی نزیک هەبوو، شوێنەکەیان بە پاڵپشتی ئەوەی ناوبانگیان رۆیشتووە، گوایە هیچ تالآنکەرێک ناوێرێ دزی بکا، جێهێشت. خۆ ئەگەر شتێکیش دزرابا، ئەوا بەحیساب دەیانتوانی شوێنپێی دزەکان هەڵبگرن و کەلوپەلەکان بگەڕیننەوە، ئەمەش بێگومان بێ پاداشتی چەور نەدەبوو، کە بەسەر خۆیاندا دابەشیان دەکرد.
شەوێکیان داود و هاورێکانی هێستری خاوەن کێلگەیەکیان لە شوێنێکدا شاردەوە، ویستیان دەرسێک بدەنە ئێشکگرەکان. ئینجا بە خاوەنەکەیان گوت، هێسترەکەی دزراوە، ئەویش بە پەلەپڕوزێ بەرەو خۆکی ئاژەلان چوو، هێسترەکە لەوێ نەمابوو. ئەوسا بە هەڵەداوان بەرەو لای ئێشکگرەکە رۆیشت، بەلآم کەس لەوێ نەبوو، پاسەوانەکە لە گوندێکی عەرەبانی نزیکیاندا لە حەفت خەوان راست ببووەوە. بۆ بەیانی پاسەوانە عەرەبەکە لەسەرکار دەرکرا، بەم جۆرە برادەرێکی داود جێگەی گرتەوە.
ئەوە دەستپێکێکی سادە بوو. لە راستیدا ئەو جۆرە کارانە ئەوانی گەیاندە سەرکەوتنەکانی ١٩٤٨ و ١٩٤٩، کە سەربازە ژێرزەمینییەکانیان بە رێکوپێکی پەلاماری لەشکرەکەی عەرەبانیان دا. لە راستیدا بنەمای ئەوەی دەبێ جوو بە خۆی لەسەر خۆی بکاتەوە، بۆ یەکەمین جار لەسەر زەمیندا و بە کردەوەش سەلمێنرا. ئەوەش هەر یەکەمین جار بوو، داود گرین سەروکار لەگەڵ کاری سەربازیانەدا پەیدا بکا. چل ساڵ دواتر بووە وەزیری بەرگری و یەکەمین سەرکردەی سوپای جوولەکە، ئەو سوپایەی کە بە درێژایی ئەو هەموو سەدانە پێکهات. ئەوەش رێگایەکی دوورودرێژ بوو، تیایدا زۆر کەس سەری لە پێناودا دانا. زۆریشی نەبرد کە یەکەمین قوربانی لێکەوتەوە.
هۆزی سیشیرێ خۆیان رێکخست و پەلاماری ئاکنجییەکانی شیرجیان دا و تەنگەتاویان کردن. داود خەڵکەکەی هێنایە سەر ئەو بروایە، خۆیان

بۆ بەرگری ئامادە بکەن و چەک پەیدا بکەن. بەڵام چۆن دەستیان بە چەک ڕابگا؟ بۆ ئەو گرفتە هەرگیز بەرسڤێکی دڵخۆشکەر لەبەردەستدا نەبوو. لە ١٩٠٧دا داود بە دوای باشترین ڕێگەی بەدەستخستنی چەکدا گەڕا. لە ١٩٤٧ دیسان بەدوای چەکدا گەڕا هەروەها لە ١٩٥٨یش.
سەرپەرشتکاری نشینگەی شیرجیا ئەسپ و گالیسکەیەکی ناردە حەیفا. کاتێک گالیسکەکە گەڕایەوە، بە شێوەیەکی ئەفسوناوی بە تفەنگە ڕەشکەکانی ڕاو و بە کۆنە جیفت Jift بارکرا بوو. ساڵانێک دواتر داود سەبارەت بەو بارە چەکە وەهای نووسی:

- "ئێمە وەک منداڵ یاریمان لەگەڵ ئەو چەکانەدا دەکرد، هەرگیز لێمان جیا نەدەبوونەوە. بە نابەدڵی بە ڕۆژ بۆسەر کار دەڕۆیشتین، چونکە بە درێژایی ڕۆژ دەرفەتی مەشقکردنمان نەبوو. هەر کاتێک لەکار دەگەڕاینەوە ماڵ و ئەسپ و ئێسترەکانمان دەبەستنەوە، ئەوسا بۆلای چەکە بۆرە خۆشەویستەکان ڕاکە، تا لەکاتی نوستنیشدا لەگەڵ خۆمان دەبردنە سەرجێ. لەکاتی نانخواردن، دەستشوشتن، ڕۆیشتن، خوێندنەوە و قسەکردن تفەنگەکانمان هەر بەشان یان بە دەستەوە لەنێو گولمەمان دابوون".

بە ڕۆژ کاری کشتیارییان دەکرد و بە شەویش ئێشکیان دەگرت. ئەوان خاکیان دەکێڵا و تفەگەکانیشیان بە شانەوە بوو.
لە دوا ڕۆژی جەژنی پاس (هەڵستانەوەی مەسیح)دا، پاسەوانێک ڕایگەیاند، کەوا دوو عەرەبی نەناسراوی لە گۆڕەپانی شێرجیا بەدیکردوون، دیاربوو لەسەر گردەکەی بەرانبەر کڵێسەکە دانیشتبوون. یەکێ لە سەرنشینانی نشینگەکە بە ناوی ئیسرائیل کرۆنگۆلد Israel Krongold بۆ سۆراخکردن بەدوایاندا چوو. دوای نیو سەعات دەنگی شێلکە تفەنگێک هات. ئیسرائیل هەر لەڕێگادا گیانی لەدەست دا.
ئەمەیان یەکەمین جار بوو ئەو گەنجەی لە پلۆنسکەوە ڕاهاتبوو، کە تەمەنی گەیشتبووە نزیکەی ٢٢ ساڵان، مردوویەک لە باوەشدا بگرێ. بێگومان دواجاریشی نابێ.
هەمان شەو داود لەگەڵ دەستەیەک لە خەڵکی نشینگەکە بەرەو نەزارەت Nazareth بەڕێکەوتن. ئەوان بەرەو ئەو شوێنەیان دەڕوانی

کە کابرای لێکوژرا بوو. یەکێ لە هاتووەکان شیمۆن میلمەد Shimon Melamedی هاوڕێی داود بوو، دارتاشێکی کارامە بوو، زۆر نەبوو بۆ کارکردن هاتبووە شێرجی. تەنها ئەو سێیەکی پێشانیشی دەستکەوت نەبوو، کەچی ئەو تێبینیە لای داود پەیدا بوو، کە بەختەوەرترین پیاوی نشینگەکەیە. ئەو خەونەی ئەو بۆی دەژیا بە ڕاستی وەرگەڕا.

لەو کاتەی ئەوان تەماشایان دەکرد، سێ عەرەبیان بەدی کردن، دیاربوو بە دوایاندا هاتبوون. داود و یەکێکی دیکە بەرەو ئەو لایە ڕۆیشتن کە ڕێی گەڕانەوەیان لێبگرن. هەر زوو شەڕ هەڵگیرسا، بەڵام هەموو گوندە عەرەبنشینەکە بەشداری تێداکرد. لە کۆتاییدا دەبوایە دیسان داود کۆمەکی ئەو کوژراوە بکا و بیگەیەنێتەوە ماڵ. ئەو جارەشیان برادەرەکەی خۆی، شیمۆن میلمەد بوو.

ئەوان زانیان ئیدی یەکەمین هەنگاوی زەحمەتیان بەرەو زایۆنیزم هاوێشتووە. گەڕانەوەش داد نادا. دەبێ خوێنی جوولەکەی زۆرتر بڕژێ تا کێڵگەکانیان بپارێزرێ و ململانێی لە نۆژەن ژیانەوەی ئیسرائیل ببەنەوە.

کاتێک داود گەیشتە شیرجیا، دیمەنی دڵفرێنی دەڤەرەکە لە ناخەوە هەژاندی. لە نامەکانیدا باسی "خونچە گوڵی زێڕین، ئاسمانی شینی کاڵ، و هەیڤی ئەفسووناوی ڕووناککەرەوەی ئاسمان و چیای کریستالی" دەکرد. بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار کەمتر شیعرئامێزانەی نامە دەنووسین. چونکە تا دەهات ڕەقێتی ڕاستەقینەی ژیانی بۆ دەردەکەوت.

شلۆمۆ زیماخ کە پێش داود هاتبووە نشینگەی شێجاریا، دژی بیرۆکەی بەرەنگاریانەی جوولەکە بوو. ئەو لەگەڵ داودا لە یەک ژوور دەخەوتن، تا قوڵایی شەو مشتومڕیان بوو. شلۆمۆ دەیگوت ئێمە بۆیە هاتوینەتەوە وڵاتی کتێبە پیرۆزەکە تا سادەییانە و بە ئاشتی بژین. گەر هاتوو بەرەنگاری عەرەبان ببینەوە، ئەوا هەرگیز ئاشتی (شالۆم Shalom) پەیدا نابێ.

وەلێ داود ڕای وابوو، پێویستە ڕاستیەکان بە جوانی ببینرێن. ئەوان هەنووکە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نەوەک لە ئەورووپا دەژین. قانونی بیابان تاکە قانونە کە عەرەبەکان لێی حاڵین. بە گوێرەی ئەو قانونە پێویستە پیاو ئامادە و لەسەر پێ بێ، داکۆکی لەخۆی بکا. لە چاوی

هـۆزە دەروننەخۆشـە تالأبـەرەکان ئـەوەی دەربـاز دەبـێ و دەیباتـەوە پاڵەوانە. کوشتنی کەسی لایدە و زێڕدزین لە فەڵەستینیدا بێرەوشتی نییە. بـە کـردار دەسـەڵاتی تـرک لێـرەدا نـەماوە. پیاوکوژەکـان بـە دەگمـەن سزادەدرێن، دزەکـان بـە ئاشکرا وەک بازرگانانی زەیتوون پیشـەکەیان رایی دەکەن و وەک بەرزەکی بانانیش بۆی دەردەچن.

هەرچەنـدە داود بـە گـوێرەی ڕوانینـی مێژوویەکـەی خـۆی هـەر گـەنجی جاران نەمابوو. دواجار کە جووەکان شەڕیان لەسـەر شـەرەفی خۆیـان، مافـەکانی خۆیـان لـەو وڵاتـەدا کـردووە لـە کۆتـایی سـەدەی یانزەهەمـدا بـووە، کاتێـک لەشـکری تانکرێـد Tancredو هێـزی دەریـایی ڤینسـی (بندەقیە) پەلاماری حەیفایان دا. هەشت سـەد سـاڵی بـەدوادا هـات، جـوو لەشکری خۆی نەبوو. هەر لەبەر ئەمە بوو، کە جیهـانی غـەیرەجوو ئـەو سـەرنجەیان لا دروسـت بـوو گوایـە جووەکـان ترسـنۆکن، ئامـادە نـین داکۆکی لە مافەکانیان بکەن. لە هەندەراندا بـە تـەواوی پابەنـدی قـانونی ئـەو وڵاتانـە بـوون کـە لێـی دەژیـان، بـەلام نوێنـەرانی ئـەو قانونانـە زۆر جـاران کـاری ڤێزەونیـان دەکـرد و چاویـان لـە بانـدەکانی دژەسـامی بـۆ کوشـت و بـە تـالانبردنی مـاڵ و حـاڵی جووەکـان دەپۆشـی، لـە جیـاتی ئەوەی بیانپارێزن.

ئەوکاتـەش کـە جووەکـان پەرۆشـی خۆیـان بـۆ نەخشـەی گەڕانـەوە بـۆ وڵاتـی دێرینـی ئیسـرائیل دەربـڕی، دەبـوایە گـۆڕانکـاری بەسـەر خۆیانـدا دابێنن. ئەم جیهانە جیهانێکە کە هەر بەتەنها هێز دەیخـوا و هـەر هێـز وا دەکا ڕێزی بگری. تا ئەوکاتەی مرۆڤایەتی لەوەدا سەردەکەوێ، کە ماف و ڕەوایـەتی بەسـەر هێـزدا زاڵ ببـێ، پێویسـتە جووەکـانیش بـەهێزبن. داود تـوانی ئـەوانی دیکـە بـەو بەڵگەوبەندانـەی (ئەرگومێنـت) سـەروو بهێنێتـە سـەر بـڕوای خـۆی، بـەلام شـلۆمۆ زامـیخ هـەر نەهاتـە ژێربـار. شلۆمۆ دواجار تەواوکردنی خوێندنی بەرەو پاریس بۆ بەڕێکەوت، پاش چەندان ساڵ ئەوسا گەڕایەوە.

داود لە خەباتی بێ وچانیدا بۆ داکۆکیکردنی لە جوولەکایەتی، پشتیوانی لـە کرێکـارانی زایـۆنیزم بەدەسـت هێنـا. لـەژێر ڕابەرایـەتی بـن زیڤیـدا ڕێکخراوێکـی نهێنیـان پێکهێنـا. ڕێکخراوەکـەیان بـە نـاوی هاشـۆمەر

Hashomer (ئێشکگرەکان) بوو، کە مەشقی بە جووەکانی سەرتاسەری وڵات دەکرد.
هەر بن زیڤیش بوو پێی لەسەر ئەوە دادەگرت، دەبێ بە زووترین کات داود بچێتە ئۆرشەلیم. داود بە شێوەیەکی گشتی حەزی لە ژیانی شار نەبوو، ئەو چەند دانەیەکی وەک وارشۆ، ئۆدێسا و کۆستانتینپۆل Konstantinopel (ئەستەمبۆلی ئێستا) دیتبوون.
بەڵام ئۆرشەلیم شتێکی دیکە بوو. ئۆرشەلیم شاری داود بوو. شا داود ناوبانگی ئۆرشەلیمی بە هەموو دنیادا بڵاوکردەوە. سالۆمۆ Salomo (سلێمان) یش کۆتەڵەکەی لە سەوزایی لوبنانەوە هێناو بە ئاڵتون نەخشاندی. ڕۆژگارێکی درێژ بوو لە ئۆرشەلیمدا ئاشتی و خۆشگوزەرانی بۆ جوولەکان مەیسەر ببوو. بەڵام شالۆم (ئاشتی) درێژەی نەکێشا. میسرییەکان، ئاشوورییەکان، گریکەکان، عەرەب، ڕۆمانی و ترک هەموویان هاتن. هەنووکەش ئۆرشەلیم شارێکە لەژێر دەسەڵاتی ترک دایە، بەڵام هێشتا جووی لێدەژین، یەکێکیشیان ئەو بن زیڤیەیە کە داوای لە داود کردبوو "بە پەلە وەرە".
بزووتنەوەی کرێکارانی زایۆنی کۆنگرەیەکیان بەست و بن زیڤی داوای کردەوە هەفتەنامەیەک بەناوی ها ئاخدوت Ha`achdu (یەکێتی) دەربکەن. ژنێکی گەنج بەناوی ڕاشێل یانایت Yanait Rachel کە تازە لە ئەورووپاوە هاتبوو (دواتر دەبێتە خانمی بن زیڤی) دەبێتە یاریدەدەر. بەڵام ژنەکە هیچ عیبری نەدەزانی. جوتیارە گەنجەکەی گالیلیا ڕایگەیاند، ئەو بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە تا زەوی بکێڵێ. بەڵام بن زیڤی هانیدا ئەرکی نوێی بەجێ بگەیەنێ. لە دوایدا گەیشتنە چارەسەرێک. داود سەرەتا دەبێ بچێتە ڕووسیا و هەندێ کاری فەرمییانە ئەنجامدا، تا وا دەربخا، ڕاژەی سەربازییانەی تەواوکردەوە، بۆ ئەوەی چیدیکە باوکی تەنگەتاو نەکەن. دواتر ئەو گەشتێک بە هەموو نشینگەکانی جوولەکاندا بکا. ئەوسا کارنامەی ڕۆژنامەوانی دەست پێبکا.
ئەو بەرنامەیە سەری گرت و داود هاتە شاری پیرۆز. وەک زگورتییەکی بزووتنەوەی کرێکارانی زایۆنیزم و ئەندامێکی دەستەی نووسەرانی هەفتەنامەی "یەکێتی" دەستبەکاربوو. لە یەکەمین وتاریدا ئامانجەکانی هەفتەنامەکەی ڕوون کردەوە. ئەو بە واژۆی

بنگوریۆنBen Gorion ناوی خۆی نووسی. ئەوەش یەکەمین جار بوو کە ئەو ناوە بەکاربهێنێ، ئیدی هەموو جیهان بەو ناوەی ناسی. ئەو پاشناوەکەی لەبەر ئیقاعە بایبلیانەکەی هەڵبژارد. "بن" بە عیبری واتای کوڕ، "گۆریۆن"یش واتای شێرێکی خورت دەگەیەنێ. ئیدی هەنووکە ئەو بووە داود کوڕی شێرە خورتەکە. بەهۆی ئەو ناوەوە لە ڕوی هێماییەوە هەموو پەیوەندییێکی بە هەندەرانەوە پچڕی. ئێستا ئەو داود بنگوریۆنی هاووڵاتی ئیسرائیلە، ئەو وڵاتەی کە لە کەڵکەڵەی ئەندێشاوی جووە ئایدیالیستەکاندایە.

داود ئێستا تەمەنی نزیکەی بیست و چوار ساڵانە، گەنجێکی ڕێکوپێکی پرچ رەش. سمێڵە ڕەشەکە لەسەر دوا مۆدێلی ترکی چاککردبوو. ئەو قاتێک، کراسێکی سپی و بۆینباخێکی خەتخەتی پۆشی. دەکرا ئەو ڕۆژنامەنووسێکی ئینگلیزی یان ئەمریکایی بوایە.

لە وتارەکانیدا ڕاشکاوانەوە هیچی تێدا نەدەهێشتەوە. ئەو داوای یەکگرتنێکی زیاتری نێو ڕیزەکانی جوولەکەکانی دەکرد، داوای زیاتر بەکارهێنانی زمانی عیبری، پشتگیری سیاسەتی سۆسیالیزمیانەی بزووتنەوەی کریکارانی زایۆنیزمی دەکرد. لە دوایشدا داوای ئابۆنەی زیاتری هەفتەنامەکەی دەکرد.

لەو سەردەمەدا سەدهەزار جوو لە فەلەستین دەژیان. تیراژی هەفتەنامەکە دووسەد و پەنجا دانەی بۆ ناو فەلەستین و سەد دانەشی بۆ دەرەوە بوو. (زۆر لە جووەکانی فەلەستین دژی بەکارهێنانی عیبری بوون وەک زمانی ئاخاوتن). لە بەرانبەر کارەکەیدا داود بنگوریۆن وەک نووسەر، هەفتانە ٢.٢٥ دۆلاری وەردەگرت.

داود بۆی دەرکەوت کە ژیانی جوتیارانەی باش لێدەهات. هەنووکەش ئەوەی بۆ ساخ بۆتەوە کە ژیانی ڕۆژنامەنووسیانەی وەک پیشە بۆ ئاسانترە. لە ماوەی ژیانیدا بنگوریۆن هەموو چاکەی ناوبانگی وەک سیاسەتوان، دەوڵەتمەدار، سەرباز، ستراتیژدانەر و سەرۆکی حکومەت هەمیشە لە چاوی ڕۆژنامەنووسیەوە دەزانی. کاتێک کە بووە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، کۆمەڵێ لە پەیامنێران داوایان لێکرد هەندێ زانیارییان سەبارەت بە وڵاتەکە بۆ وتارەکانیان بداتێ. لە بەرانبەردا گوتی:

- "من شتە ناوازەکان بۆ ئەو وتارە هەڵدەگرم کە بەتەمام بینوسم" ئەنجا بە متمانەوە پێیگوتن؛ "ئاخر لەبیرتان نەچێ ئەزیش ڕۆژنامەنووسم".

# بەشی ٣

گەر هاتباو گەنجەکە پێش چەند ساڵێک نەوەک لە ١٩١٣دا پێی نابایە سەر وشکانی خاکی سالۆنیکیSaloniki، لەوانەبوو بهاتایە سەر ئەو بڕوایە، کە هەڵەیەکی کوشندەی کردووە و دەستبەجێ بگەڕابایەوە. بەڵام داود بنگۆریۆن نەیدەزانی ماوەیەکی زۆر نابا و جەنگی جیهانیی هەڵدەگیرسێ، لە ئاکامی جەنگەکەدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە بار یەک هەڵدەوەشێ، بەمەش گۆشەی باشووری ڕۆژئاوای ئەورووپا و بەشێکی زۆری ڕۆژهەلاتی ناوین، لەنێویشیاندا فەلەستین لە چنگی ترکەکان ڕزگاریان دەبێ.
دەستپێشخەرییکی نوێ ختوکەی بنگۆریۆنی جوتیار- پاسەوان- ڕۆژنامەوان- سیاسەتوانی دا، بەوەی لە ڕۆژگاری نوێدا ئەرکێکی نوێی لێچاوەڕوان دەکا. هەرچەندە تەمەنی نەگەیشتبووە بیست و حەوت ساڵ، بەڵام هەستێکی گەرمی لا گەلاڵە ببوو، کە خۆی بۆ سەرکردایەتییەک ئامادە بکا.
لەو ساڵانەی لە ئۆرشەلیمدا بووە، دەرفەتی خوێندن و لێکۆڵینەوەی باری سیاسیانەی بۆ هەڵکەوتبوو. جووەکانی فەلەستین لەنێو ئاکنجییەکانی وڵاتدا کەمینەیان پێکدەهێنا.

- "ئێمە بە گوێرەی قانونی دەستووری، بە واتای تەواوی وشەی کۆمەلایەتی و سیاسییانە هیچ ڕەگوڕیشەمان لەو خاکەدا ڕانەهێشتووە، کە بەهۆیەوە بە پێی ڕاگەیاندنی خۆمان بمانەوێ ماڵێک (نیشتمانێک)ی جوولەکان دروست بکەین."

- "من بۆیە بڕیارم دا بچمە قوستەنتینە (ئیستەنبول) تا قانونی تركی یان عوسمانی بخوێنم و ببمە پارێزەر، ئەوسا ژیانی قانونیانەی خۆم بۆ داکۆکیکردن لە مافی هاووڵاتی و کۆمەڵایەتیەکانی خەڵکی جوو لە ئیسرائیلدا تەرخان بکەم".

بنگوریۆن ئەو نەخشەیەی لەگەڵ بن زیڤی تاوتوێ کردبوو. بن زیڤیش دەیویست بڕوا.

- "ڕەنگبێ لە داهاتودا بەیەکەوە وەک نوێنەری جوولەکەکان بچینە نێو پەرلەمانی ترکان".

لەسەر ئەوە ڕێککەوتن سەرەتا بنگوریۆن بڕوا، ئەوسا بە دوایدا بن زیڤیش بچێ. هەنووکە "یەکێتی" دەستەی تەواوی بەڕێوەبردنی خۆی هەیە. ئەوانی دیکە دەتوانن جێی بنگوریۆن و بن زیڤی بە باشی پڕبکەنەوە.

بنگوریۆن سەرەتا پێیخۆشبوو بچێتە سالۆنیکی چونکە زۆر جوولەکەی لێدەژیان و بزووتنەوەی کرێکارانی جوولەکەیشی لێ کارابوو. ئەوسا بەرەو قوستەنتینە بەڕێکەوت و لەوێ ناوی خۆی لە خوێندنگەی قانونی عوسمانیدا تۆمارکرد. هەر ڕێکەوت ئەوەی خواست، کە هاوپۆلێکی عەبدوڵلای بن حوسێن بێ کە کوڕی حوسێنی بن عەلی(شەریفی مەککە) بوو، ئەو عەبدوڵلایەی لە ١٩٤٦دا بووە شای ئوردن و ساڵی دواییش کوژرا.

هەر زووش بن زیڤی لە قوستەنتینیە خۆی گەیاندە بنگوریۆن. گەشتیارە بێگانەکان ئەوانیان وەک دوو ترک تەماشا دەکردن. ئەوان فێسێکی سووریان لەسەر دەنا و چاکەتێکی ڕەشیان لەبەردەکرد و بۆینباخێکی ڕەشی سادەشیان دەبەست. هەر دووکیان سمێڵیان وەک ترکێکی ڕەسەن هێشتبونەوە. ماوەیەکی زۆر برادەرەکانیان بە جمک ناویان دەهێنان.

ئیدی بە دوای ئەواندا، برادەرەکانی دیکەشیان هاتن، موشێ شێترۆک کە دواتر بووە شارێت Sharett، ئەوکات گەنجێکی تەمەن نۆزدە ساڵان بوو، تازە قوتابخانەی دواناوەندی تەلئەبیبی تەواو کردبوو، هات. تەلئەبیب ئەو شارەی سەر کەناری یافا بە خڕی شارێکی جوولەکان

جار شتێکی گوت، ڕەنگبێ بگوترێ شتێکی دێوانەییە؛ بۆ نموونە بیرۆکەکەی بۆ بەپایەتەختکردنی ئۆرشەلیم، یان پەرەپێدانی ئیلات وەک بەندەرەشارێک، بەڵام دوای یەک دوو هەفتە یان یەک دوو مانگ ئیدی مایەی شێتایەتی نییە گەر خەڵک بڵێن: ئا، بەڵی ئەرێ بە ڕاست بۆ نا؟"

مەبەست لەو پەیڤانە ئەوەیە، کە بگوترێ ئەو پێغەمبەرە و نیگایەکی سروشییانەی هەیە.

## بەشی ٢٢

ساڵی ١٩٥٣ بە نوکتەیەک دەستی پێکرد.

چەنـد مانگێـک پێشــتر، بنگۆریــۆن و وەزارەتــی کاروبــاری دەرەوە، برووســکە و برووســکەکاری نهێنییــان لەگــەڵ کرملینــدا دەربــارەی ڕێگەدانی ڕووسیا بە کۆچکردنی جووەکان بۆ ئیسرائیل دەگۆڕیەوە. لە یاداشتێکدا ئیسرائیل ئەوەی خستبووە ڕوو، کە ئامادە نییە بۆ دژایەتی یـەکێتی شـۆرەوی بچێتـە نێـو هـیچ پەیمانێکـەوە، چونکـە لـە بەرانـبەردا ئەوانیش ڕێگا بە کۆچی بێسنووری جوولەکەکان دەدەن. بـەڵام مۆسـکۆ پێشنیازەکەی پشتگوێ خست.

کـاتێکیش پاکتـاوی کۆمۆنیسـتانە لـە چیکۆسـلۆڤاکیا دەسـتی پێکـرد، ئیسـرائیل بەوپـەڕی پەرۆشـیەوە بەدوایـدا دەچـوو، ئـاخر هەسـتی دژەسـامییش لـە سـەنگی مەحەکـدا بـوو، هــەروەها ئیسـرائیلییەکیش (ئەنـدامێکی ماپـام) لـەو کـات کـە لـە چیکۆسلۆڤاکیا بـوو، یـەکێک بـوو لەوانـەی سـکاڵای لەسـەر بـوو. ئـەوەش لەڕاسـتیدا واتـای بـەکردەوە هیـوابڕانی تـەواو بـوو بـە هاوکـاری مۆسـکۆ و پایەتەختـەکانی دیکـە وڵاتانی کۆمۆنیزم بوو.

بنگۆریۆن لەوە دوودڵ بوو کە هاوپەیمانێتییەک لەگەڵ کۆنەپارێزەکانی پارتی زایۆنیزمی گشتی پێک بهێنێ، چونکە دەترسا ئەندامە چەپەکانی پارتەکەی خۆی بەرە ماپام بڕۆن، بەڵام کاتێک یانزە ئەندامی بەرچاو لە پـراگ تۆمـەتبارکران و لـەدوا مانگـەکانی ١٩٥٢شـدا بڕیـاری مردنیـان بەسەردا درا، ئیدی بنگۆریۆن ڕاوێژی لەگەڵ پارتی زایۆنیزمی گشتیدا کـرد. ئـەوانیش ڕایانگەیاند، ئامـادەن بـە چەنـد مەرجێـک هاوپەیمـانێتی لەگەڵدا ببەسـتن، کـە حکـوومەت کـەمتر خـۆی لـە کاروبـاری بـازاڕ

هـەڵبقورتێنی، دەستپێشـخەرییە تایبەتییـەکان هانبـدرێن، هەلومـەرجی سـەرنجراکێش بـۆ سـەرمایەی تایبـەتی دەرەوە فەراهـەم بکرێ کـە بـۆ ڕەوشی وەبەرهێنانیان بە پێویست دەزانی.
ئـەوەبوو لـە ڕۆژنامـەی ماپای (پارتی سـەرەک وەزیران) وتارێک بڵاو بووەوە، بە توندی هێرشی کردە سەر ماپام (پارتی کۆمۆنیستی نزیک لـە یـەکێتی شـۆرەوی)، چونکـە پارتی نـاوبراو دەیەویست لـە هـەردوو بەری جۆگەکە بلەوەڕێ: حیسابیان لەسەر جیهانی کۆمۆنیزمی دەکرد، بـەڵام پشـکی خۆشـی لـە وڵاتـە سـەرمایەدارەکان لەسـەر حیسـابی کیبۆتـەکان دەویسـت. وتـارێکی بـەهێزی ڕاشـکاوانە بـوو. شـێوازی نووسینەکەی بۆ نووسەرێکی ناسراو نـەدەچوو، کە لـە بواری سیاسیی و وێژەدا بزوێنەر بێ. وتارەکە بەناوی سـابا شێل یاریڤ Saba Shel yariv (باپیرەی یاریڤ) واژۆ کرابوو. دیاربوو ناوێکی خوازراو بوو.
ئـەودەم زۆر کـەس دەیپرسـی ئـاخۆ ئـەو نووسـەرە نوێیـە کێیـە کـە گەیاندویەتیـە مریشـکە ڕەشـە و هیچـی تێـدا نەهێشـتۆتەوە، وتـاری دووەمیشی بەدوادا هات، تیایدا باسی پاکتاویەکەی پراگی کردبوو، ئیدی ماپامی لەوە ئاگادار کردەوە، کە دەبێ لە نێوان کۆمۆنیزم و زایۆنیزمدا، یەکێکیان هەڵبژێرێ.
لـە سـێهەمین وتـاردا وێنـای یـەکێتی شـۆرەوی وەک "مـاڵی کۆیلـەکان" و ستالینیشی (کە تا ئەو کاتە ژیاندا مابوو) وەک بەدترین بکوژ لـە مێژوودا لەقەڵەمدابوو. لە وتاری چوارەمیشدا پەردەی لەسەر کێشە و دەمەقاڵێیە نێوخۆکانی ماپام هەڵدایەوە.
جەماوەری خوێنەر ئەو کاتـە مـەتەڵەکـەیان هـەڵێنا، کە یـەکێکیان، ئەوەی بیرخسـتنەوە، کە گێـولای کیژەکـەی بنگۆریـۆن کـوڕێکی بـەناوی یـاریڤ هەیە.
پێدەچوو سـەرەک وەزیـران ئـەو چارەسـەرییەی بـۆ ئـەوە هـەڵبژاردبێ، بتـوانێ ڕاشـکاوانەتر بنووسـێ، بێئـەوەی پێگـەی خـۆی وەک سـەرەک حکوومەتێک لەنێو پێشـهاتە پـەرەسـەندووەکانی نێودەوڵەتیدا بخاتـە ژێر پرس و مەترسییەوە. بـە فـەرمیش هـەرگیز دانـی بـەوەدا نـەنا، کـە خـۆی نووسـەرەکەیە، بەڵام چەند مانگ دواتر لە کەنیستدا گوتی:

- "هەنووکە دەمەوێ بڕگەیەک لەو وتارەی کە بەناوی سابا شێل یاریڤ بڵاوکراوەتەوە، بهێنمەوە."

ئیدی ئامادەبووانی هۆڵەکە لە قاقای پێکەنینیان دا.

- "ڕەنگبێ ئەوە ببێتە مایەی سەرسامیتان گەر بڵێم، تا ڕادەیەک لەگەڵ سەرجەم ڕای نووسەری وتارەکەدا کۆکم."

لە ڕۆژی دوشەممەی ٩ی فێبرایری سەعات ١٠:١٠ی شەودا، سێ ڕۆژ دوای بڵاوبوونەوەی وتاری ناوبراو، کە هێرش کرابووە سەر یەکێتی شۆرەوی، نارنجۆکێک فڕێدرایە نێو ئەو خانووەی نێردەی ڕووسی تێدابوو. بە هۆیەوە دەبوایە هاوسەری نوێنەرەکە، ژنی فەرمانبەرێک و شوفێرەکە بگوازرابانەوە نەخۆشخانە.

سەرلەبەیانی سێشەممە بنگوریۆن، کە زۆر لە دەرچە سیاسییەکانی ڕووداوەکە دەترسا، لە کنێستدا ڕوونکردنەوەیەکی دا و بەو پەیڤانەی خوارەوە دەستی پێکرد:

- "ئەز لە ناخەوە بەو کردە شەرمەزارییەی، کە دوێنێ شەو قەوما، نیگەرانم."

بنگوریۆن ئەو وشەیەی بەکارهێنا کە لە بۆنەیەکی دیکەدا مێناحێم بێگینی پێ تووڕە کرد:

- "ئەوە ئاژاوەیە، کە ئەو تاوانبارە ترسنۆکە پێیهەڵساوە، بە پلەی یەکەم دوژمنایەتی ئیسرائیلی پێکردووە؛ ئەوسا ڕق و کینەیان بە لایەنی دەرەکی دەربڕیوە. گەر ئامانجیان لە کردەکەدا ئەوە بووبێ، داکۆکی لە شەرەفی ئیسرائیل بکەن، ئەوا پێویستە پێیان بڵێم بەو کردەوەیان شەرەفی ئیسرائیلیان شکاندووە."

ئەو چوارشەممەیە، هەواداراە کۆمۆنیستەکان خۆپیشاندانێکیان بەدەستپێشخەری یەکێتی دۆستانی یەکێتی شۆرەوی لە ئیسرائیلدا ساز دا. بیست ژن و پیاوی تێدا بریندار بوون.

لە پێنجشەممەشدا، یەکێتی شۆرەوی پەیوەندییە دیپلۆماتیکییەکانی لەگەڵ ئیسرائیلدا پچڕاند. گۆلدا مێرسۆن (مایەر) کە ماوەیەک نوێنەر بوو، لە مۆسکۆ ڕایگەیاند: "ئەوە بۆ ئیسرائیل، بۆ گەلی جوولەکە و بۆ تەواوی جووەکانی یەکێتی شۆرەوی ڕۆژێکی ڕەشە."

ڕهێبیکا سیف Rebecca Sief سەرۆکی یەکێتی ژنانی زایۆنیزمی نێودەوڵەتیی، کە دایکی مارکوس سییف بوو، بنگۆریۆن و هاوسەرەکەی لە پشووی ڕۆژانی هەفتەدا بانگهێشتی ناوچەی تەلمۆدی باکووری تەلئەبیب کرد. بنگۆریۆنیش داوای لە خانمێکی ئینگلیز "خانم (ب)" کرد بەڵکو لە گەشتەکەدا یاوەریان بێ.

لەکاتی چونە ئەوێدا و لەناو ترۆمبێلدا خانم (ب) پرسی:

- "ئەرێ جەنابی بنگۆریۆن بۆچی ویستت منتان هاوگەشت بم."

سەرەک وەزیران پێکەنی.

- "من دەزانم ئێوە خانمێکی لێبڕاوانەن، حیساب لەسەر ئەوە دەکەم کە تۆ خانمی خانەخوێ، پاولا و ژنانی دیکە هەموو شەممە و یەکشەمە بە تەواوی سەرقاڵ بکەی."

خانم (ب) ئەوەی لەتوانایدا بوو و ئەرکەکەی بە باشی ڕایی کرد. بێجگە لەکاتی ژەمەکان کەس سەرەک وەزیرانی نەدی. لە شەوی شەممەدا ژوورەکەی جێهێلا و لە باخەکەدا لەگەڵ خانم (ب)دا پیاسەی دەکرد. دوو پۆلیس دووربەدووری ئەوان شوێن پێیان هەڵگرت. (تەل مۆمن دەکەوتە سەر تەسکترین بەشی ئیسرائیل، لەوێ زێ لە لای چەپەوە هەر هەشت کیلۆمەتر دووربوو، لە ڕۆژهەلاتیشەوە تەنها سێ کیلۆمەتر لە سنووری ئوردنەوە دووربوو.)

خانم (ب) چاوەڕوانی دەکرد تا بنگۆریۆن دەست بەقسان بکا. ئەویش بە بێ دەنگی لەگەڵ خانمەکە دەڕۆیشت. لە هەموو پیاسەکەدا کەسیان قولماتی لە زار نەهاتە دەرەوە.

بەیانی پاشتر سەرەک وەزیران ڕۆژنامەکانی دەخوێندنەوە و ئینجا دیسان گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی، هەموو ڕۆژەکە هەر بەتەنها مایەوە. کاتێکیش بۆ شەوەکەی گەڕانەوە تەلئەبیب، بنگۆریۆن بە خانمە ئینگلیزەکەی گوت:

- "ئێستا پێت دەڵێم بۆچی پێویستیم بەو بێدەنگییە ئارامە هەبوو. من دەبوایە بڕیارێکی چارەنووسساز بدەم. کێشەی توبیانسکی Tubianskyم لەبەردەستدا بوو. ئیدی من بڕیاری یەکلاکەرەوەم دا، کەواتە ئێستا دەتوانین قسە بکەین."

نزیکەی هەموو کەسێک لە ئیسرائیل بە کێشەی توبیانسکی دەزانی. مایەر توبیانسکی ئەفسەرێکی گەنجی هاگانا بوو، لەسەردەمی شەری رزگاریخوازییدا بە تۆمەتی ناپاکیی تاوانبارکرابوو. لەبەردەم ئەنجوومەنی جەنگدا ئامادەبوو، بریاری مەرگی بەسەردا درا و جێبەجێش کرا.

سالانێک تێپەرین، بێوەژنەکەی بە دوای سۆراخی راستی رووداوەکەدا گەرا و تیشکی نوێی خستەسەر. بە پلەی یەکەمیش دنەدانی بەدواداچوونەکەی بەهۆی کورەکەیەوە بوو، کە هەستی بە بەدبەختی خۆی دەکرد. زۆر جاران لە مال دەیگوت، کە لە لایەن قوتابییەکانی قوتابخانەوە تیروتوانجی تێدەگرن بەوەی کوری باوکێکی تاوانبارە.

کەمێک بەر لەوەی بنگوریۆن بۆ پشووی دوایین رۆژەکانی هەفتە بچێتە تەل‌مۆند، بێوەژنەکە لێکۆڵینەوەکەی تەواوکردبوو، فایلەکەی دابووە سەروەزیر، تیایدا لەسەر بێتاوانی مێردەکەی مکورِبوو. وەک سەرەک وەزیران و سوپاسالاری لەشکر دەبوایە بنگوریۆن بگاتە ئەو دەرەنجامەی کە هاورای ئەرخاینبوونی بێوەژنەکە بوو.

کاتێکیش کە بنگوریۆن ناوی کێشەکەی برد، پاولا لێی پرسی: "پاشان، تۆ لەبارەیەوە چی دەڵێی."

مرۆ دەیتوانی وەلامەکەی لە دەموچاوە خاوبووەکەی بنگوریۆندا بخوێنێتەوە.

– "هاتومەتە سەر ئەو بروایە کە کابرا بێتاوان بووە."

رۆژی پاشتر نامەیەکی بۆ خانم توبیانسکی نووسی، نامەکە شیاوی ئەوەبوو هەر ئابراهام لینکۆلن[°] بینووسیبایە.

– "لە توانامدا نییە نیگەرانی خۆم بە وشە دەرببرم... ئەو دادوەرانەی لە کاتی لە سێدارەدانیدا ئامادەبوون، رایانگەیاند کەوا ئازایانە مردووە، ئەوی رەت کردۆتەوە، دەستەکانی ببەستنەوە و پارچە پەرۆیەکی رەشی لە چاوان ببەستن، تەنها ئەوەی داواکردووە، منداڵەکەی باش پەروەردە بکرێ... دەبێ لە

---

[°] Abraham Linkoln (١٨٠٩–١٨٦٥) شانزەهەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یەکەمین سەرۆک بوو لە ماوەیەی دەسەڵاتەکەیەدا بکوژرێ. لینکۆلن بە دژایەتیکردنی شەری ناوخۆ و کۆیلەکردن بەناوبانگ بوو–وەرگێر

قوتابخانــەی کوڕەکەتــدا نمایشــێکی تایبــەت ســازبدرێ، تیایــدا ئاشکرا بکرێ، کە لەشکر چ هەڵەیەکی تراژیدی کردووە. ئەوسا بــرادەر و هاوپۆلــەکانی دەزانــن کــەوا بــاوکی وەک دەرچەیــەکی کوشندەی سەرلێشێوانی دادگاوە ژیانی لەدەست داوە، ئیدی با کوڕەکەت شانازی بە باوکە قوربانیەکەیەوە بکا..."

لە حوزەیراندا سام هامبورگ گەڕایەوە ئیسرائیل. چوار هێکتار کێڵگە کشتیارییە نموونەییەکەی بە لۆکە داچاندبوو، هاتبوو سەرێکیان بدا. ڕۆژێکیان خۆی بە ژوورەکەی بنگوریۆندا کرد و دەستە چیلە بڕکە لۆکەیەکیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. سڵاوێکی لە سەرەک وەزیران کرد و ئەو بڕکە گیایەش کە لۆکەکەی گرتبوو نیشانیدا و گوتی:

- "تەماشــاکە گــەورەم! ئێمــە بووینــە یــەکێ لــە گرنگتــرین وڵاتــە بەرهەمهێنــەرانی لۆکــە. ســەیری ئــەو دەســتە بڕکەیــە (دەســتە چیلەیە) بکە! هەرچەندە زیاتر لە ٣٠ ساڵە لۆکە دەڕوێنم، هەرگیز لۆکەی وا هارم لە حوزەیراندا نەدیوە."

ســەرەک وەزیــران دەســتەچیلە لۆکەکــەی لێــوەرگرت، بــە پەنجــەکانی لۆکەکەی گوشی و پێکەنی.

- "ئیسرائیل سوپاست دەکا."

هامبورگ یاری بە شەپقەکەیەوە کرد.

- "شایانی نییە، من سوپاسی ئێوە دەکەم. من هــەرگیز نەمــدەزانی، کە لۆکە وام دەخرۆشێنی. بەڵام ئەو کێڵگە بچووکە هەستێکی وای پێبەخشــیم کــاری باشــتر بکــەم، کــە بەشــێک بــێ لــەو شــتە گشتییەی لەوەی تا ئێستا پێشکەشم کردووە."

لە ڕۆژێکی هاویندا، کە بیابانی نەقەب مرۆڤی دەهێنایە سەر کەڵکەڵەی قاڵبی توانــەوە و لمیش لەبەر گەرما تــاوی دەســەند؛ بنگوریــۆن لەگــەڵ هێزێکــی ســەربازییدا گەشــتێکیان بــەرەو ئــیلات کــرد. نزیکــەی هەشــتا کیلۆمــەتر لــە خــوارووی بیئــر ســەبعەدا کاروانەکــەیان لــە ئاڤدات Avdat وەســتاند. ئاڤــدات ئــەو شــوێنە بــوو، کــە نەخشــەکان وەک قوچــەکێکی

سەراوبن نیشانیان دەدا. ئەوەش واتای ئەوەی دەگەیاند کەلە چاخەکانی زۆر کۆندا نشینگەی لێبووە.
لە سەر گردە بەرزە سەد و پەنجا مەتریەکەدا، شوێنەواری بێزەنتییەکان، ئەو دەفرە قوڕاویانەی کە بۆ ئاو کۆکردنەوە بەکاردەهێنان، دۆزیەوە؛ دیاربوو نیشانەی کلتووری گەلێکی دێرین بوو.
بنگۆریۆن ئەو شتەی ئەوەندە پێخۆش بوو، بۆیە بە پێ بەسەر گردەکە کەوت. ئەو زیاتر پێیلێنا و بەخێرایی سەردەکەوت، هەندێ جار ئەوانی دیکە بە ئاستەم پێی ڕادەگەیشتن. تەنانەت بۆ گەنجەکانیش گەشتێکی بازوو ماندوکەر بوو، بەڵام سوپاسالارە پیرەکەیان ئەوەندە تاسەمەند بوو، نە تاوی گەرما، نە شەکەتبوون، نە تینوێتی، نە ئەو لمەی بە با لەچاوانی دەدا، نە تیشکی سوتێنەری ڕۆژ کە لە تۆقی سەری دەدا و نەهیچ شتێک لە بوێرییان بۆ بەسەر گرد هەڵگەڕاندا کەم نەدەکردەوە.
لەنزیک ئاقاداتەوە سەربازەکان یەک دوو کوڕە گەنجیان دیتن، کە سەر بە کیبۆتنشینێکی ئەو ناوە بوون بەناوی سدێ بۆکر Sde Boker (کێڵگەی شوان). بەدوای جێگایەکی لەبار بۆ لەوەڕاندنی پەزەکەیان دەگەڕان.
سدێ بۆکر تەنها سەد مەترێک لە ڕێگە سەرەکییەکە دوور بوو، بنگۆریۆن لەگەڵ یاوەرەکانی لەگەڕانەوەدا سەردانێکی کردن.
نشینگەکە ساڵی پێشوو لە لایەن دەستەیەکی پێکهاتوو لە دوانزە کچ و کوڕی گەنج دامەزرابوو. هەموویان لەکاتی شەڕدا لە نەقەب سەربازییان کردبوو، بۆیە زانیاری ئارکیۆلۆژی تەواویان لەسەر ناوچەکە هەبوو، کە لە سەدەکانی ڕابردووشدا جێ نشینگە بووە. ئەوان پارەیان بەقەرد لە ئاژانسی جوولەکان وەرگرتبوو؛ دەبوایە دوای بیست ساڵ قەرزەکەیان دابایەوە؛ هەنووکەش دەستبەکارن تا وای نیشان بدەن ژیان لە بیاباندا بەردەوامە. سەرەک وەزیران پرسی جۆربەجۆری سەبارەت ئەزموونەکەیان لێکردن.
جارێ سدێ بۆکر یەک دوو خانووی دارین و درەختێکی هەژارانەشی لێبوو، بە تێلدڕ پەرژینیان بەدەورەوە وەرینا بوو.
ژیان لەوێ بەراییانە بوو؛ زۆر جاران ناخۆش و هەندێ جاریش دژوار بوو. گەر لە بیاباندا بایە بە هێزەکەی لە سەر لمەکە هەڵکردبا، هەندێ

جـار دەبوایـە دەسـت بدەیـە بـەرچاوت تـا پێشـچاوی خـۆت ببینـی. عەرەبـەکان بـەو بـایەی باشـوورەیان دەگـوت خەمسـین (بـەعبریش شاراڤSharav). بایەکە زۆر گەرم بوو، پێستی دەموچاوی دەسوتاند. بیاباننشینەکان دەڵێن بایەکە وا لە پیادە دەکا، هۆشی لەدەست بدا. لمە بـە بـا هەڵکردووەکـە دەچـووە نێوچـاو، کونـە لـوت و گـوێ، گـزۆز و ماشینی ئۆتۆمبیلەکان، بە کون و کەلەبەری نادیارەوە دەهاتە نێومـاڵان، قورگ و گیانی هەموو زیندەوەرێکی بیابانشینی دەگرت.
ڕەوەنـدە عەرەبـەکان و میسـرییەکان کـە سـنوورەکەیان زور دوور نـەبوون، نیشـانەی مەترسـی بـوون. یـەکێ لـەو دوو کچانـەی لـە دامەزرانـدنی کیبۆتەکـەدا هاوکاریـان کردبـوو، ڕۆژێکیـان بـووە شـوانی مـێگەلە مـەڕێک. کـاتێکیش نەگەڕایـەوە، بـەدوای سـۆراخیاندا چـوون. شوێنەواری مەڕەکان دیار نەمابوو، بەڵام لاشەی کچەکەیان دۆزیەوە.
کـۆبرای میسـرییش زۆر دژوار بـوو، ئـاخر ژارەکـەی مەڵبەنـدی دەمارەکانی پەک دەخست، قوربانیەکەی لە جووڵە دەخست و لە ماوەی بیست خولەکدا دەیکوشت. دەستپێکەکانی سدێ بۆکر هەموو مانگێک جوتێکیـان لێـدەگرتن. کیبۆتنشـینەکان چـاڵیکی قووڵیـان لێـدابوو، گەیشبوونە ئاو، بەڵام سوێر بوو بەکەڵکی بەکارهێنان نەدەهات. ماوەی حـەفت مـانگی ڕەبەق وشـکوبرینگ بـوو، تیشـکی ڕۆژ وا لمـی گـەرم کردبوو وەک ئاسنی داغی لێدەکرد. لە ماوەی پێنج مانگەکەی دیکەدا سێ جاران لافاوێکی وا هات کە ئاو بەسەر گردەکاندا لێشاوی بەستبوو وەک ئـەوەی لمەکـە بووبێتـە شووشـەچیمەنتۆ. ئاوەکـە لـە دۆڵەکـەدا گردبووەوە. هـەروەک جووەکان لەمێژ بوو فێرببوون، گەنجەکانیشیان بەربەست و گۆلیان دروستکرد تا باراناوەکەی لێ کۆبکەنەوە، گەر هاتوو پێویستیان پێبوو بۆ ئاودانی کێڵگەکانیان بەکاری بێنن.
ئاو بۆ مرۆ و مەڕ و ماڵات بە تانکەر دەهات. ئاخر هێشتا بۆڕی ئاو بۆ نشینگەکە ڕانەکێشرا بوو.
پلەی گەرما بە تیژی دەگۆڕا، لە هەندێک کاتی ساڵدا ئاو تا سەعات هەشتی بەیانیش دەیبەست.
کاتێ بنگۆریۆن گەڕایەوە نووسینگەکەی خۆی، بانگی ستافەکەی کرد و باس و خواسی ئەوەی لە گەشتەکەیدا دیتبوو بۆ گێڕانەوە. دەربارەی

ئاکنجیانی نشینگەکە گوتی: "من ئێرەیی بەو لاوانە دەبەم. ئای کە چ ژیانێکی نایابە."
لە ڕۆژەکانی بەدوایداهاتن ناوبەناو هەندێ سەرنجی دەردەبڕین وەک ئەوە: "هیچ مرۆڤێک بێ خەوش نییە."
ئەوە شتێک بوو دەیویست زیاتر لە بارەیەوە بدوێ. بەڵام هەر ئەوەندەشی لێزیاد کرد: "لەسەر هیچ کەسێکمان پێویست نییە، زۆر لەجێگەی خۆیدا بمێنێتەوە، هەرلەبەر ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئێمە زۆرمان پێویست پێیەتی."
دواتر جارێکی دیکە گوتیەوە: "پیاوە بە تەمەنەکان پێویستە دەرفەت بدەنە لاوەکان."
لە دواییدا لەپاولای پرسی: "ئەرێ چۆن دەبینی، کە من و تۆ بچین لە بیاباندا بژین؟"
ڕۆژێکیان لەسەر کارتێکی ٧.٥ بە ١٢.٥ سەنتیمەتر نامەیەکی بۆ ماپای نووسی و دایە تایپیستەکە تا کۆپی بکا.
هێشتا کارمەندەکانی باوەڕیان نەدەکرد.
بنگۆریۆن لە کۆبوونەوەی بەڕێوبەرە سەرەکییەکانی ماپای ئامادەبوو، کاتێ نامەکەی خوێندرایەوە.

- "ئەز چیدی ناتوانم بەردەوام بم... من هیچی دیکە بەرگەی ئەو پێشهاتە گرژانەی دادێ وەک سەرۆکی حکوومەت ناگرم... شەش ساڵە لەژێر گوشارێکی گەورەدا کار دەکەم... ئەوەش ماندوبوونێکی ئاساییانە نییە..."

بنگۆریۆن پێیڕاگەیاندن کە بڕیاری داوە دەست لەکاری سەرەک وەزیریی و وەزیری بەرگیدا بکێشێتەوە، بەڵام حەز دەکا کورسییەکەی پەرلەمانی بمێنی و دەچێتە سدێ بۆکر دەژی.
لە ساتەکانی یەکەمەوە بەرپرسە باڵاکانی پارتەکەی وەک ئەوەی تووشی کارەساتێکی گەورە ببن هێدمەیان گرت. پاشان یەک بە یەکیان قسەیانکرد و داوایان لە بنگۆریۆن کرد بە بڕیارەکەی خۆیدا بچێتەوە.
بنگۆریۆن بە بێدەنگیەکی خۆبچووک کردنەوانە گوێی لێگرتن.
خانمێکی دەستەی بەڕێوەبەر کە لە جەنگدا دوو کوڕی لە دەستدابوون، قسەکانی ڕێک ئاراستەی ئەو کردن و پێگوت: "گەر من هەر دوو

کورەکانم پێشکەشی نەتەوە کردبێ، چۆن دەتوانی تۆ دەستبەرداریان بی.
کۆبوونەوەکە بێئەوەی سەرەک وەزیران یەک وشەی زیاتر بخاتە سەر نامەکەی یان لە بڕیارەکە پاشگەز ببێتەوە، دواخرا.
کاتێکیش هەواڵەکە بڵاوبووەوە، دەستلەکارکێشانەوەکەی بنگوریۆن شەو و ڕۆژ لە ئیسرائیلدا لەپێشترین بابەتی قسە لەسەرکردن بوو.
لە حەیفا کۆمەڵە سۆشیالیستێکی لایەنگری پارتەکەی ڕایانگەیاند، گەر هاتوو لە پایەکەیدا نەمێنیتەوە، ئەوا ماندەگرن. تەلەفۆنی پاولا هەرگیز لە زەنگداندا نەدەکەوت؛ دەبووایە بۆ زەنگلێدەران چەند بارەی بکاتەوە، کە ناتوانێ لەو بارەیەوە لەگەڵ پیاوەکەی قسە بکا. نامەکان لەناوەوە و برووسکەکان لە دەرەوە بە لێشاو دەهاتن.
پاولا وەک هاوسەرێکی بەخشندە کاردانەوەی بوو، بڕیارەکەی مێردی پەژراند. هەنووکە ئەو لە سەرووی شەست ساڵەوەیە و مێردەکەش شەست و حەفت ساڵ. دەیزانی، ژیانی کیبوتنشین زۆر زەحمەتە. ڕەنگبێ ژیانی بیابان لەسەرووی هێز و توانای ئەوانەوە بێ. بەڵام بنگوریۆن بڕیاری خۆی داوە و پێویستە کەلوپەلی ناوماڵ تێکبنێ.
تەنانەت ئەوانەی باشیشیان دەناسی لەگەڵ بەڵگەوبەندی ڕۆیشتنەکەی هاوڕا نەبوون. یەکێ لە کارمەندەکانی گوتی؛ ئەو دەیەوێ لەوە بکۆڵێتەوە ئاخۆ گیانیش وەک جەستە پیر دەبێ، یان ئەگەری ئەوە هەیە بە خۆدەربازکردن لە ئاستەنگی ڕۆژانە لە تەمەنێکی شەست و حەفت ساڵیدا بە دوای بواری نوێ و گیانێکی سەرچڵیانەی نوێدا بگەڕێ.
زیاترین وەڵامە نەرێتییەکە بەلای ئەوەدا دەچوو، کە ئەو لە خەمەکانی حکوومەت تێر بووە، دەیەوێ ژیانێکی ئارام و هێورەییانە وەک ڕووناکبیرێکی بێ هەڵپە بەسەر ببا.
خەڵکی دیکەش هەبوو پێیانوابوو، بنگوریۆن دەیەوێ جارێ لاپەڕگە ببێ و بەتەنیا بژی تا تەواو تیشکۆی بیری بکاتە سەر ڕێگە چارەسەرەکانی کێشە سەختەکانی ئیسرائیل.
بە گوێرەی ڕامانی کەسانی دیکە؛ گەنجەکانی ئیسرائیل بێئومێدیان کردووە. خولیای کۆنە دەستپێکیکەی جارانی سەرهەڵداوەتەوە. بەڵێ ئیسرائیل سنووری هەبوون، بەڵام دانیشتوانی سەر سنووری نەبوون.

سەردەمەکە سەردەمی بنێشت، سووراوی لێو، گۆڤارە گاڵتەجارییەکان، فیلم و خێرهێنەکانی دیکەی شارستانێتین، بۆیە خەڵکی گەنج زیاتر بە پیریانەوە دەچێ لەوەی ژیانێکی نوێ لە بیابانی کۆن کە دوو هەزار ساڵ دەبێ مردووە، بژیێننەوە. ئەوەندەش کۆچبەر لە تەلئەبیبدا کۆبوونەتەوە، کاتی خۆیان لە چایەخانەکاندا بەسەردەبەن، دوکانۆکە دەکەنەوە، نایەنەوێ لەگەڵ خاکدا (کشتیاری) ئیش بکەن.
باشترین ڕوونکردنەوە ئەوەبوو کە بنگۆریۆن خوازیاربوو نموونەسەرمەشق بێ، چونکە ووشەکانی چی دیکە دادی نەدەدان.
یەک دوو تەوسلێدەریش گوتیان کەوا نمایشکردنی شانۆگەرییکە؛ ئەوانی دیکەش پێیان وابوو، دەیەوێ هەندێ ڕەگەزی نەتوانراو لەنێو حکوومەتدا بسەلمێنێ. هەندێکیشیان بە نیشانەی بەرگریان لەقەڵەم دەدا چونکە دەبووایە لەسەر حیسابی باربووە دارایییەکەی ئەمریکاوە دەستبەرداری کۆمەڵێک بنەمای سۆشیالیستی بێ.
زۆرینەی کیبۆتەکان پەیوەندییان بە گروپێکی ئایینی یان سیاسییەوە هەبوو، بەڵام سدێ بۆکر ئەوەشی نەبوو. ئەوەش واتای ئەوەی دەگەیاند سەرچڵییەکەی بنگۆریۆن لە هەڵسەنگاندنی سیاسییەوە بە دوور بوو.
لەماوەی پێنج ساڵی سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئیسرائیلدا، هیچ هەواڵێک وەک دەستلەکارکێشانەوەکە وروژێنەر نەبوو، ئاخر خۆ پێشهاتەکەش هەموو ڕۆژ ڕووی نەدەدا، کە سەرەک وەزیرانێکی خۆشەویست بگەڕێتەوە کوڵێتێک و لە بیاباندا بژی.
لە پایەتەختە جۆربەجۆرەکاندا وتاری لێتێگەیشتن و هەستپێکردن بڵاو بوونەوە، ئەوانەش هی کەسانێک بوو کە نانیان لەسەر نووسین بوو. ئەوان تێگەدەگەیشتن، کە بۆچی ئەو بڕیارەکەی داوە. ئیدی ئەو چوار ئامێر تەلەفۆنانە بەردەوام زەنگیان لێدەدا، ئەو هەموو میوانە، ئەو لەو هەموو دیدارانە، ئەو هەموو بارگرانییەی کارگێڕیدا ڕزگاری بوو. ئەوەی لەگەڵ ئاشی ئەو هەموو ڕێکخستنانەدا بڕوا، بێگومان هەندێ شێتیش دەبێ؛ هەموو ئەو بیچمە ناودارانە و میوانە پایەبەرزانە لە ماوەیەکی دووردا تووشی دەمارگرژی دێن. ئەوەش دەرەهاوێشتەی پیشەکەیانە.

لە وتارێکدا پەسنی بنگوریۆن درا، چونکە بوێری تێدابوو، لە جەنجاڵی، سەرقاڵی و هاتن و چوونی بەردەوامی نێوان ئۆرشەلیم و تەلئەبیب ڕزگاری بوو.
بێئەوەی ناوی کەس ببەن مەبەستیان سەرۆک دەوڵەتانی دیکە بوو کە لە پیشەی دەسەلاتدارێتیان تووشی دەیان گێچەڵی دەمارگیری بوونە، ک کارێکی باش دەکەن کە بگەرێنەوە بیابان و دەرفەتی خەڵکی لەشساخ و گەنج بدەن. بۆ ئەو جۆرە کەسانە بنگوریۆن نموونەیەکی باشی نیشان دا، بەلام پێدەچی کەسانێکی کەم هەبن چاوی لێبکەن.
لەسەر خوانی نیوەڕۆدا کە حکوومەت لەسەر شەرەفی خواحافیزیکردن لە بنگوریۆن ڕێکی خستبوو، بنگوریۆن لەودیوی مێزەکەوە بۆ پاولا چەمایەوە، کە پێناچوو زۆر کەیفساز بێ و بە دەنگە نەرمەکەی بڕگەیەکی لە کتێبی یەرمیاس Jermiasی بایبل خوێندەوە:

- "من بەرێزەوە لە بەرانبەر لاوێتیت، خۆشەویستی سەردەمی بوکێنیت، ئەو کاتەی بە دوای مندا هاتیە بیابانێکی بەیار، کڕنووش دەبەم."

لە ٥ی دیسێمبەردا بنگوریۆن، سی و شەش ساڵ بوو ژنی هێنابوو. پاولا ئاهەنگی ساڵرۆژەکەی بەوە گێڕا، کە لەگەڵ هەواڵنێرانی ئۆرشەلیم دەربارەی ڕابردوو و ئایندە قسە بکا.

- "بنگوریۆن ئەو سی و شەش ساڵە هاوسەرێکی ئازا بوو، پیاوێکی خۆشەویستی مشوورخۆر." ئەو لەو ساڵە دوورودرێژانەدا یارمەتی داوە لە قاپشوشتن و بەڵێنیشی پێداوە لە سدێ بۆکردا ڕایەخەکانیشی لەگەڵ هەڵبکوتێ و داوەشێنێ، بەلام هەڵبەت پاولا لێینەدەگەڕا.
- "ئەو دەبێ بە بەرهەم بێ. پشکێکی زۆری کاتەکەی بە نووسین بەسەردەبا."

لە بەیانییەکەی ٧ی دیسێمبەردا، بنگوریۆن نامەی دەستلەکارکێشانەوەکەی خۆی پێشکەشی سەرۆک بن زیڤی کرد:

- "هیچ کەسێک لە هەڵە و خەوش بە دوور نییە، بێگومان ئەزیشی لێبەدەر نیم... ئیسرائیل بەبێ سەرکردە نامێنێتەوە. بەخت و چارەی هەر نەتەوەیەک پابەند نییە بەو پرسەی ئاخۆ کێ

سەروەزیرە یان نا... سەرۆک وەزیران دێن و دەڕۆن، بەڵام حکوومەت بە قانونەوە پابەندە و پشتی لێکردۆتەوە... هیوادارم ڕۆیشتنم هیچ قەیرانیکی بەدوادا نەیەت. موشێ شارێتی دۆستم جارێ بە شێوەیەکی کاتی ئەرکی سەرۆک وەزیرایەتیی لە ئەستۆ دەگرێ... من تەواو لەو باوەڕەدام کە بە بێ دۆشداماں و وەخرانەوە حکوومەتێکی نوێ بە پشتگیری کنێست دادەمەزرێ."

هەمان شەو سەرەک وەزیرانی دەست لەکارکێشاوە لە ڕادیۆدا دوانی بۆ نەتەوەکەی دا. دوانەکەی خواحافیزکردنێکی سۆزبزوێنانە نەبوو، بەڵام دەنگی یەک دوو جاران لەرزی و زۆر لە گوێگرانیش پێیوە هەژان.

- "من لە ئەرکەکەی خۆمدا هەوڵمداوە بەپێی توانام کارەکان ڕایی بکەم، بەوپەڕی بەخشندەیی و خزمەتکارییانە لەڕاژەی وڵات و گەلەکەمدا بم. گەلۆ هەڵبەت من ئەوە ناڵێم کە هیچ هەڵە و کێماسیم نەبووە و نییە. بە هەموو ڕاشکاوی و کراوەییەکەوە ئەو وشانەی هۆزانڤانی ڕۆڤی کە لە کۆپلەی یەکەمی هۆنراوەی ١٤١ بایبلدا هاتوە وەک هی من بن، دەڵێمەوە:
- "خودایە، دڵی من ئاو ناخواتەوە
چاوەکانم شاناز نین
من بە ناو شتە مەزنەکاندا گوزەر ناکەم
چ جای ئەو شتانەی کە بۆ من مایەی پەرجوێتین."

ئەو بڕیاریدا، دوانەکەی بە کۆپلە دەقێکی پێغەمبەر هاباکوک Habakuk کە ڕەنگبێ باشترین ڕوونکردنەوی خواحافیزیکردن بێ، کۆتایی پێبێنێ:

- "دادپەروەر لەنێو بڕوای خۆیدا دەژی. ئەو کەسە نییە کە قسە و نمایش بۆ خەڵک بکا، ئەو کەسە پیرۆزئاسایە نییە، کە خەڵکی دیکەی بە گوێرەی قانون بە دوادا بکەون، ئەو بە دوای هەڵەی کەسە نزیکەکانی ناگەڕێ، بەڵکو بڕوای خۆی لە ژیانی ڕۆژانەدا بەرجەستە دەکا و پێوەی دەژی."

لە یەکشەممەی ١٣ی دیسامبەردا، پاولا و مێردەکەی لە کاتی ئاساییانەی خۆیان زووتر لە خەو هەڵسان. دەبوایە کەلوپەلەکانیان تێکبنێن. پێش ئەوەی لە بەرچایی ببنەوە میوانیان هاتن، بە تایبەتیش لە

کارمەندانی حکوومەت و دۆستە دێرینەکانیان بوون، هیوای گەشتێکی خۆشیان بۆ خواستن.
کەلوپەلی ماڵەکەیان لە ترومبێلێکی وەزارەتی بەرگری بارکرا. جێیبی پڕ لەسەرباز لە گەشتەکەیاندا تا دوا مەنزڵگەیان یاوەریان بوون.
کاتێکیش بۆ دواجار بە ماڵەکەیاندا گەڕان، بنگۆریۆن بە پاولای گوت:
- "ئەری ئەو دەستە بڕکە لۆکەیەی سام هامبورگت تێکناوە."
پاولا لە هێنانی دڵنیا کردەوە.
بە پێچەوانەی خووەکەی سەرەک وەزیرانی پێشوو، دەستی هەموو پاسەوانانی ماڵەکەی لە شەقامی کێرم کیامەت ژمارە ١٤دا گوشی. خێزانەکەی هەر یەکە و وێنەیەکی مێردەکەی بە واژۆکەوە پێبەخشین.
کاتێکیش سواری ترومبێلەکان بوون، بنگۆریۆن ئاوڕێکی لە ئاپۆرەی خەڵکەکە کە بۆ خواحافیزی هاتبوون، دایەوە. هەندێکیان بە دەسرۆک (دەستەسڕ) فرمێسکی چاوەکانیان وشک دەکردنەوە. دەستێکی بۆ ڕاوەشاندن و هاواری کرد:
- "مەگریێن و فرمێسک مەڕێژن، باشتر وایە ئێوەش دوام بکەون."

## بەشی ۲۳

بە گوێرەی پێوەرە ڕووپێویەکانی ئەمریکایی، نەقەب گەورە نییە. لە تەکساسدا چوار پارێزگا هەن، هەر پارچەیەکیان لە بیابانی ئیسرائیل بەرینترە. هەڵبەت سدێ بۆکر بۆ پاولا بنگۆریۆن کە هەموو ژیانی لە شارە گەورەکاندا بەسەر بردووە، شوێنێکی لاپەڕگەبوو؛ هەر چوارلای هەر گرد و زورگی لماوی بوون، هیچ دوکانێکی داودەرمانیشی لێنەبوو، ڕووی تێبکا. دەبوایە پاولا منداڵەکانی، نەوەکانی، دراوسێکان، دۆست و ناسیاوەکان و خودی خۆشیی شارستانێتیە نوێیەکە لە پاش خۆی بەجێبێڵێ بێتە بیابان. لە سدێ بۆکردا تەنها چەند دانە ژنێک دەژیان، کە هەرە بەتەمەنەکەیان ژنێک بوو، هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە سیساڵی، بەدەر لەوان دوو دەرزەن پیاوی گەنج و بنگۆریۆن هەبوون. بەڵام پێدەچێ بنگۆریۆن زیاتر بە کتێب و ڕۆژنامەوانان خەریک بێ. کەواتە لەوێدا هیچ کەس نامێنێتەوە کە لەگەڵیدا بکەوێتە قسەوباس. دڵە بەخشندەییەکەی وای لێکرد، بە بێ قرە بۆ هەموو شوێنێک بچێ.

زۆری نەبرد تۆز و غوباری سەر ڕێگا بۆ دانیشتوانی سدێ بۆکر نیشانەی هاتنی کاروانێک بوو. پاولا یەکەمین کەس بوو لە ترۆمبێلەکە دابەزی. هەر دوو دەستی پڕبوون لە دەسکە گوڵ کە لە بیئر سەبعە پێشکەشیان کردبوون.

- "گەر لێرە کەسێک نەخۆش کەوت، ئەوا لە تەنیشتیان دادەنێین. بەڵام دەبێ هەر زوو بخرێنە ناو ئاو تا وشک هەڵنەگەڕێن."

ئیدی لێرە قسە لەسەر بەخێرهێنانێکی فەرمییانە نەبوو. هەموویان لە داگرتنی بارەکەدا یارمەتیان دا. لەسەر فەرمانی سەرەک وەزیرانی

پێشوو هەموو پۆلیسە سەربازییەکانی لەگەڵیان هاتبوو سەر و وێنەیان لەتەک بنگۆریۆندا گرت.
هەواڵنێرەکان ویستیان پرسیاری لێبکەن.
- "ئاخۆ لێرە چ کارێک وەردەگریّ؟"
بە کورتی وەڵامی دانەوە: "جاریّ هیچی بیرۆکەیەکم نییە. خۆتان دەزانن کە ئێرە کیبۆتە. سکرتارییەت کارەکان دابەش دەکا. هەرچی بۆیان دانام، دەیکەم."
لە وەڵامی پرسێکی دیکەدا، تەنها کورتە وەڵامێکی دایەوە: "گەر من لێرە یەک دوو ساڵان بژیم، ئەوسا دەتوانم ڕوونی بکەمەوە، کە چیم کردووە و ئایندەکەشی چۆن دەبیّ."
بە ئێوارە درەنگەوە هەواڵنێران، وێنەگرە ڕۆژنامەوانییەکان، دۆست و برادەر و یارمەتیدەران، هەموویان ڕۆیشتنەوە.
پاولا تەنورەیەکی لۆکەی سادەیی لەبەرکرد. لەبەرئەوەی بۆ بنگۆریۆن ڕۆژێکی مێژوویین بوو، قاتێکی تۆخ و بۆینباخی بەستبوو، ئیدی دایکەند و شۆرتێکی خاکی و کراسیکی کردەبەر.
بە پێکەنینەوە بە ژنەکەی گوت: "بەخێر بێن بۆ سدیّ بۆکر."
هاوسەرەکەشی لە ناخیەوە وەڵامی دایەوە: "هیوادارم لێرە شادمان بی."
لەو کاتەی بنگۆریۆن خەریکی دانانی کتێبەکانی بوو، پاولاش ماڵی پاک دەکردەوە.
یەکەمین میوانیان، منداڵێکی تەمەن چوار ساڵ و نیو بە ناوی چەمی کۆهن Chemi Cohen کە کەم تەمەنترین کۆلۆنیست بوو، هات لەبەردەرکە وەستا و بە زمانی عیبرییانە پرسی:
- "ئەریّ تۆ کێی؟"
سەرەک وەزیرانی پێشوو بە خەندەوە وەڵامی دایەوە:
- "من نوێترین دەستپێکم Chalutz."
- بنگۆریۆن و هاوسەرەکەی کەسی نۆزدەهەم و بیستەمین بوون کە هاتنە ڕیزی کیبۆتەکە. کاتێک پاولا بۆ یەکەمین جار ماڵەکەی کە تەنها خۆی و مێردەکەی لێدەژیان دیت، بە غوربەتێکەوە گوتی:

- "ئەو خانووە لە بەنگەلۆی دوورگەی کۆنی Coney Island دەچێ. کاتی خۆی لە نیویۆرک لەگەڵ چەند برادەر هاوینێک بەکرێمان گرتبوو."

ئەو کۆڵێتە ڕەنگ زەردەیان ١٣.٥ بە ٥.٤ مەتر بوو لە سێ ژوور پێکهاتبوو؛ بۆ هەریەکەیان ژوورێکی نوستن و ژوورێکیش بۆ کتێبخانە و شوێنی کارکردن هەبوو. کەلوپەلەکانی لەسوئێدەوە هاتبوون. لەولاشەوە ستونێکی ڕادیۆ هەبوو کە چەند ئامێرێکی پێوانی لێ قایمکرابوون. لەسەر بانی خانووەکەی بنگۆریۆن ئامێرێکی لێبوو، کە زۆرجاران نیشانی میوانەکانی دەدا و دەیگوت: "ئەمەیان هەرزانترین ئاوگەرمکەرەوەیە لە جیهاندا."

ئەوەش پەیوەندی بە تیشکدانەوە هەبوو. هەموو تیشکەکانی ئاسمانی سەر بانەکەی بۆ خۆی کێشدەکرد و ئاراستەی خاڵێکی ئاسنینی بچووکی دەکرد، کە تانکی ئاوی ماڵەکەیان بوو، ئیدی هەمان پلەی گەرمای وەک زۆرینەی میوانخانەکان دەپاراست.

لە سدێ بۆکردا دەبوایە سەعات ٥.٤٥ خولەکدا لەخەو ڕابووبان. کاری یەکەمی بنگۆریۆن تۆمارکردنی پێوانەی پێوەرەکان بوو.

لە سەعات هەشت تا نۆ کاتی نانخواردنی بەیانی بوو. فراوینی نیوەڕۆش لە دوانزە و نیو تا یەک بوو، شێوی ئێوارانیش لە سەعات حەوتی ئێوارەوە دەستی پێدەکرد. کاریشیان لە شەش تا هەشت، لە هەشت و نیو تا دوانزە و نیو، لە یەکیشەوە تا سەعات چوار بوو.

شەوان کیبوتنشینەکان خەریکی خوێندن و خۆپەروەردەکردن بوون؛ ئینجا خەریکی سازدانی نەخشە و پلانیان بوون کە نەدەبوایە بەلاوە بنرێ.

ژەمەکان لە هۆڵێکی خواردنی هاوبەشدا ئامادە دەکران. هەندێ لە گەنجەکان شۆرتیان لەپێدابوو، ئەوانی دیکە پانتۆڵی خاکییانە. زۆرینەیان بە تاوی کراس بەو ناوەدا دەڕۆیشتن. کچەکانیش تەنورەی کورت یان درێژ و بلوزێک. تەنها نوێ هاتووەکان پێڵاویان لەپێ دەکرد، چونکە هێشتا بەرپێیان لە لمە سووربووەوەکەی بیابان ڕانەهاتبوو.

کاری پاولا ناندین و ژووری منداڵان بوو. زانیاریی داودەرمانییەکەی لەوێ باش فریای کەوت، گەر هاتبا یەکێک لە ڕێگا بە ڕووداوی

ئۆتۆمۆبێل، یان بەشەڕ و دەمەقاڵێیەک بریندارببووبا، دەیانگەیاندە لای. (لەسەرەتادا هیچ پزیشکی لێنەبوو. دواتر یەکێکی بۆ هات، ئەوانەی تازە دەردەچوون دەبوایە بۆ ساڵێک لە شوێنێکی دوور مەشقیان بکردبایە. پاشان پزیشکێکی گەنج بەشێکی ژیانی بۆ ئەوان تەرخان کرد و هاتە سدێ بۆکر.)

لە بیاباندا زۆرجاران ئاسکیان بەدی دەکرد، بە شەویش گوێیان لە دەنگی ڕێوی و کەمتیار دەبوو.

سدێ بۆکر ڕووبەرێکی دوانزە هکتاری بە خۆخ، ترێ و سەروزە داچاندرابوو، باقیەکەشی وەک پاوانی پەزەکانیان بەکار دەهێنا.

کیبۆتەکە سەد مەڕێک، دوو مانگا، یەک دەرزەن ئەسپی عەرەبی و یۆگسلافی و هەزار سەر مامری لێدەبوو. کیبوتنشینەکان خوری مەڕەکانیان بە خۆیان دەبڕیەوە، خوریەکەیان لە شە دەدا، بۆیەیان دەکرد و جلیان لێ دروستدەکرد.

مانگێ یەکجار ترومبێلێکی باری ئازووقە لە تەلئەبیبەوەڕا دەهات. سەبارەت بە ڕادیۆش ئێزگەی قاهیرە و تەلئەبیی وەردەگرت.

ئاودانی کێڵگەکانیان دەبوایە لە دوای نیوەڕۆ پێش ڕۆژئاوابوون بوایە. بە ڕۆژ بایەکەی وا توند هەڵدەکرد ڕێڕەوی ئاوەدانەکەی دەگۆڕی.

تەنها شەش سەعات لە ڕۆژدا کارەبایان هەبوو. دەبوایە دەست بە ئاوەوە بگرن.

کیبوتەکە دیارییەکان دایە پاولا کە زۆری کەیف پێهات: بەفرگرەیەک کە بە نەوت کاری دەکرد.

هەموو ڕۆژ و شەو دەبوایە کیبوتنشینێک لەگەڵ مەترالیۆزەکەیان ئێشکگر ببا. دوو لە سەرنشینانی کیبوتەکە کوژرابوون؛ کچە شوانێک و کوڕە گەنجێکی دیکە.

بنگۆریۆن تا نانی نیوەڕۆ بە گوێرەی خشتەی کاری گشتی دەڕۆیشت، دوای نیوەڕۆیانیش دەینووسی. دوای ژەمی ڕۆژئاواش، سەعاتێک پێش نوستنی دەینووسی یان دەیخوێندەوە.

یەکەمین کاریان کە دایە بنگۆریۆن ئیشی کێڵگە بوو، دواتر کرایە شوانی مەڕەکانیان.

پاولا دەبوایە لەپاڵ کارە گشتیەکانی کیبوتەکە، ماڵی خۆیشی پاک بکردبایەوە: جیبوبالینگانی هەڵدەگرت، گەسکی دەدا، و شتەکانیشی لە شوێنە گشتیەکەدا دەشوشت.
ئەوانەی سەری سدێ بۆکریان دا، تێبینی ئەوەیان کرد شتێک لە رەفتاری بنگۆریۆن بەرانبەر هاوسەرەکەی گۆڕاوە. یەکێک لە کۆنە دۆستەکانی گوتی:

- "پێش سەرچڵییەکەی بیابانی، بنگۆریۆن هەموو شتێکی بە گوێی پاولا دەکرد. پێی ئاسایی بوو هەمیشە پاولا شتەکانی بۆ ئامادە کردبان. بەڵام لە سدێ بۆکردا، کە بەردەوام بە یەکەوەن، ئەوسا تێگەیشت کە پاولا چ زەحمەتیەکی بۆ ئەو بینیوە و چی بۆ کردووە. بنگۆریۆن لە جاران دڵگەرمتر و مشوورخۆتر بوو.."

لە ڕوانگەی دیکەشەوە بنگۆریۆن لە بیابان گۆڕابوو. ئەو دۆستانەتر و مەحشەرخۆشتر لەگەڵ ژینگەکەی دەهاتەوە. هەمیشە بیرۆکەکان بۆ ئەو لە مرۆڤەکان گرنگتر بوون، وەلی لەو کۆمەڵگە زۆر بچووکەی نێوەراستی بیاباندا کە لەوەتەی سەردەمی سەرەتای گەنجێتی لە دەستپێکەکانی گالیلیا بەقەد ئێرە لەگەڵ کەمترین ژمارەی مرۆڤدا هەڵسوکەوتی نەکردووە، کەچی هەنووکە زۆر کەیفسازە و بەگەرمی لەگەڵ ژینگەکەی هەڵدەکا.
لە یەنایریدا کۆلۆنیستێکی نوێ پەیدا بوو. ڕوس ئالێکسندرۆڤسی Ruth gailadi Alexandrovsi کیژێکی تەمەن بیست و چوار سالانی پرچرەشی چاو زەقی سابرایی بوو. کچەکە و بنگۆریۆن زۆر بە یەکەوە کاریان دەکرد و بوونە برادەر. کچەکە هەموو ئەو خەسڵەتانەی هەبوون کە بنگۆریۆن بۆ گەنجەکانی بەهەند دەزانین. کیژێکی بەهێز، سەرنجڕاکێش، ڕوناکبیر و چاوکراوە بوو.
هەرگیز لە خۆیەوە نەدەدوا. زۆر جاران لەگەڵ بنگۆریۆندا بە بێدەنگی ئیشیان دەکرد، هەردووکیان بە سەعات لەکاتی کارکردندا لە کێشەکان بە بێدەنگی قوڵدەبوونەوە. بەڵام دوایی لە پڕێکەوە بنگۆریۆن ڕووی تێدەکرد تا لێی بپرسێ:

- "ئەرێ تۆ بڵێی چی بەسەر ئەو هەموو لاوانەی ئیسڕائیلدا هاتبێ؟ بۆچی بە هەزارانیان وەک تۆ ڕوو ناکەنە بیابان؟"

چەند جارێک ویستی بۆ پیرەمێردەکەی ڕوون بکاتەوە. جارێکیان گوتی:
"جەنگ سەردەمێکی خۆش نەبوو. پاشان ئێمە شتێکمان لەدەست دا. ناشزانم بە دەقاودەقی چی بوو. ڕەنگبێ ئێمە دژواریتیمان لەدەستدابێ. ڕەنگبێ تەمبەڵ بووبین. ڕەنگبێ حەزمان لە خۆشگوزەرانی بێ. لەوانەشە زۆر بیر لە شتی لاوەکی بکەینەوە."
لە ماوەی گفتوگۆکانیاندا بنگوریۆن کە نزیکەی ساڵێک دەبوو لە کێڵگەکانی ئۆهیۆ Ohio و گۆرجیا Georgiaدا مابووەوە و باوکی دەناسی چونکە لە تەوژمی دووەمی کۆچبەرانی سەر لە زوو لە کیشنیڤ Kishinvەوەڕا هاتبووە فەلەستین.
پاولا و ڕوس زۆر جاران بە ئینگلیزی لەگەڵ یەکدی دەدوان، ئەو بە شێوەزاری بروکلینانە، ڕوسیش بە تێکەڵاوییەکی شێوەزارە سترانبیژیانەی گورجی و ڕەوانیە ئۆهیۆکەی.
هاتنی بنگوریۆن بۆ کیبوتەکە بووە مایەی سەرئێشی جۆربەجۆر بۆیان. گەر کەشوهەوا خۆش بووبا، ئەوا زۆر میوانیان دەهاتن؛ لە ڕۆژێکیاندا زۆر کەس هەر بۆخۆشی لە گەشتیاران، کارمەندانی حکوومەت، پایەبەرزە بیانیەکان، هەواڵنێران و وێنەگران و خەڵکانی دیکەش سەردانیان دەکردن. مرۆڤ دەبوایە ژەمە خواردنێک بداتە هەمووان، هەندێ جاریش دەبوایە لای خۆیان جێیان بۆ کردبانەوە.
ئەرێ چۆن کیبوتنشینەکان ئەندامە نوێکانیان بانگ کردبان؟ ئەوان هەمیشە بە پێشناوی یەکەم و بە تۆ یەکدیان بانگ دەکرد، بەڵام ئەدی هەنووکە؟
بۆیان ئەستەم نەبوو بە خانمەکەی بنگوریۆن بڵێن پاولا، بەڵام پێیان شیاو نەبوو کۆنە سەرۆوەزیری پێشوو لە بنگوریۆن بترازێ بە ناوێکی دیکەی بانگ بکەن.
لە دوا هەفتەی فێبرایەردا بنگوریۆن ئامادەبوو پێشوازی لە ڕۆژنامەوانان بکا. هەواڵنێران تێبینی ئەوەیان کرد، هەندێ ڕەشتاڵە بووە و تەندروستیشی وەک کوتک باشە. خانووەکەیان زۆر بچووک بوو، جێی هەموو میوانانی نەدەبووەوە، بۆیە بانگهێشتی نێوحەوشەی ماڵی کردن و لەسەر زەوی جێگای بۆ ڕاخستن.
- "خاکێکی نایابە و شورەیی نییە گەر لەسەری دابنیشی."

ئەو نەچووە سەر باسی پێشهاتە نوێکانی حکوومەت و ڕەتی کردەوە وەڵامی ئەو جۆرە پرسانەیان بداتەوە، بەدەر لەوە زۆر دۆستانەتر و هاوکارانەتر بوو لە جاران. ئەو خۆی هەندێ جاران خۆشی دەدایە دیدار و چاوپێکەوتنەکان.

- "من ئێستا ئەندامی کابینەی حکوومەت نیم. تەنها ئەندامێکی ئاساییانەی کەنیستم کە کاری ئاسان دەکا."

لێیان پرسی ئاخۆ چ ئیشێکی وەرگرتوە:

- "جاری چاوم لە بزنەکانی نێو کۆزەکەیە کە تازە زاون و کاریلەیان پەیدابوون."

نەیدەویست دەربارەی ئایندەی خۆی بدوێ، بەڵام دەربارەی پاشەڕۆژی نەقەب گوتی: "دەکرێ ئەو دەڤەرە ببێتە پڕ دانیشتوانترین ناوچەی ئیسرائیل. تاکە کێشەش، بە تەنها هەر ئاوە."

بە گەرمییەوە ئاوڕێکی لە دانیشتوانی سدێ بۆکر دایەوە کە لە دەورەی دانیشتبوون، ئینجا گوتی: "ئەو کۆمەڵە خەڵکەی نەقەب هەندێک دێوانەن، بەڵام من ئەو دێوانانەم خۆش دەوێن."

لە مارتدا بنگوریۆن وتارێکی بەناونیشانی "بۆچی خۆم کێشایە نێو بیابان" بۆNew York Timesدا نووسی: "ئەگەر هێز بۆخۆی ئامانج نەبێ بەڵکو تەنها داردەستێکی ڕاژەی نەتەوە بێ، کەواتە هەقە هەموو دەوڵەتمەدارێک بە هەستێکی بەرپرسیارانەوە لە میانەی تێپەڕینی ڕۆژگاردا لە خۆی بپرسێ: ئەرێ ئەزیش نەبوومەتە قوربانی دەستی خوو؟ تۆ بڵێی توانام هەروەک جاران بە بەهێزی مابێتەوە؟ ئایا بە تەواوی هۆشمەوە ئاگام لە هاوڵاتییەکەی ئاسایی - کە هەموو شتێک لەپێناوی ئەودایە- گەلەکەمدا هەیە؟

- "ئەو سەرۆک دەوڵەتەی خۆی بە هۆکارێکی بڕیاردەر بەسەر چارە و بەختی وڵاتەکەی بزانێ، ئەوا زیانبەخش و کوشندەیە. ئەو گرژیە بەردەوامەش کە لەسەریەتی و داگیری کردووە یان هەرەشەیە بەسەریەوە لەمپەرێکە بۆ نواڕینێکی تازەی کاروبارەکان، ئەوا دەبێتە مایەی لاوازکردنی هەر بڕیاردانێکی پێویست، ئیدی سەرپێیانە لێیدەڕوانێ بێئەوەی بە دوای

ڕەگوڕیشـــەیدا بچـــێ و لـــە بڕیاردانـــادا پرســـەکە جدییانـــە هەڵبسەنگێنێ... گەر ئەوە ڕوویدا، وا باشترە خۆی بکێشێتەوە..."

بەشـی دووەمـی وتارەکـەی تـەرخان بـوو بـۆ ئـارەزووە خۆشەویسـتە دووەمەکەی: کار لەگەڵ خاک کردن و خوێندنەوە.

- "بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی من، ژینگەی سروشتی بە بایەخترین دەروربـەرە بـۆ مـرۆڤ. بە پێـی ئـەوەی مـرۆڤ چەنـد خـۆی لـە دەسـتکارییەکانی شارسـتانیتی نـوێ دەکێشـێتەوە... ڕووبـەڕوی سروشـــتێکی دڕ و دەســـتلێنەدراو (وەک چـــۆن یـــەدزان ئافرانـدوویەتی)دا دەبێتـەوە، لەوەشـیاندا بیابـان نموونەیـەکی سـەرمەشـقە، ئـەوا هەسـت بـەوە دەکـا باشـتر لـە ڕازی ژیـان و ئەرکی خۆی لەسەر لە زەویدا بگا."

بـە ڕێکـەوت بـوو گـوتی کـەوا تـەورات (قـانونی جوولەکـان) لـە بیابانـدا ڕادەسـتی موسـای گـەورەترین مامۆسـتای ئیسـرائیل کـە گەلەکـەی پەلکێشی چۆلستان کرد، کرا.

بڕیاریـدا ئـەو ڕاگەیاندنـەی هەنگاونانەکـەی ڕوون بکاتـەوە: "لە دواییـدا شوێنێک بۆ سەرەک وەزیران پەیدابوو، بەڵام شـوێنی سـەدان، هـەزاران بگـــرە ملیۆنـــانیش ئەوانـــەی دەیانـــەوێ بیابـــان ببوژێننـــەوە، هەیـــە. چارەنووسی دەوڵەت زیاتر بە کۆمەڵ بەستراوەتەوە لەوەی بە تـاک. لـە ڕۆژگـارێکی وەک ئێسـتاماندا تـاک هەسـتێکی وای لا گەڵاڵـە بـووە، تـەنها ئەو کارانە بکا کە بە جەماوەر دەکرێن و پێویستە بکرێن."

لە ئایاردا ئەو وەرزە داهات کە دەبوایە خوری مـەڕەکانیان ببڕدرێتـەوە. لە ڕووی فیزیکیەوە جەستەی بنگۆریـۆن بـێ خـەوش بـوو. ئـەو و ڕوس بە یەکەوە ئیشیان دەکرد. پیدەچوو بەبێ کێشـە کـاوڕێکی پـەنجا کیلـۆیی هەڵبگرێ و لەسەر تەختە دایبنێ تا سابرا لاوەکە بە کەلـەخ خورییەکـەی ببڕێتەوە. بەڵام بنگۆریۆن ئەوەی فەرامۆش کردبوو، کە تەمەنی شەسـت و حەفت ساڵانە و لە مێژیشە دەردە پشتئێشـەی هەیە. لە دواییدا دەبوایە لەسەر جێگەدا بکەوێ چونکە لـە سدێ بـۆکر هـیچ پزیشـکێکی لێنـەبوو، پاشـان گەیەنرایـە نەخۆشـخانەی تەلئـەبیب. سـێ هەفتـەی خایانـد تـا گەڕایـەوە دۆخـی جـارانی و سـەرلەنوێ دەسـت بـە ژیـانی دەسـتپێکیی خۆی بکاتەوە.

لەو کاتەی خوری مەڕەکانیان دەبرییەوە، ڕوس نهێنیەکی خۆی هێنایە سەرزمان. ئەو لە حوزەیراندا شوو بە کوڕەلاوێکی درێژی نشینەگەی زێیڤ ستاینهاردت Zeev Steinhardt دەکا. دەیەویست بنگوریۆن لە کەسە یەکەمەکان بێ کە بە هەواڵەکە بزانێ. ڕوس گوتی: "هیچ لەوە خۆشتر نییە، کە لە بیاباندا دڵداری بکەی."

لەو ماوەدا پاولا هەستی بە ژان و ئازارێکی زۆر کرد؛ دەبوایە بۆ چارەسەری بگەیەنرابایە نەخۆشخانەی هاداساhadassa لە ئۆرشەلیم.

کاتێکیش خۆی و مێردەکەی گەڕانەوە سدێ بۆکر، دەستە مێوانێکی نوێیان هاتن. سام هامبورگ هات و دیاریەکی نائاساییەنەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو: فەردە لۆکەیەک، یەکەمین بەرهەمی لۆکەی ئیسرائیل. کاتێک فەردە لۆکەکەی نیشانی بنگوریۆن دا، پاولا لەو ساتەدا هاتە ژوور:

- "ئەرێ ئێوە و ناوی خوا، پێم ناڵێن ئەمە چییە؟"

پێش ئەوەی هامبورگ بۆی ڕوون بکاتەوە، مێردەکەی گوتی:

- "ئەمەیان گرنگترین شتە، لەم ساتەدا ئیسرائیل پێویستە هەیبێ."

بە تروسکایی چاوێکی خەونبینینەوە بنگوریۆن نیگایەکی بڕیە سەر بەرهەمەکە و خاکەکەی کە بە گوێرەی پسپۆڕان بێ بایەخ بوو. هەنووکە هامبورگ زۆر باشی دەناسی، دەیزانی بیر لە چی دەکاتەوە. ڕێزگرتنی ئیش، شانازیکردن بە ئیشی قورس بۆ بەدەستهێنانی بەرهەم، تێگەیشتن لە بایەخی کێڵگەکانی لۆکە، خاکێکی پڕ دارتوو، پرتەقاڵ و کێڵگەی سەرتاپا داچێندراو بە چەوەندەری شەکر. ئەو شتانە بوون، کە بنگوریۆن دەیویست گەلەکەی فێریان بێ.

هامبورگ یاوەری بنگوریۆن بوو کە بە خۆی و ڕیشە سپییەکەوە چووە لای کۆزی بەرخەکانی و دەستی لێدەدان. دواتر هامبورگ بە دۆستەکانی گوت:

- "کاتێ بنگوریۆنم بە سەرقاڵیەوە دەدی، دەبوایە بیر لە گاندی و خەڕەکەکەی بکەمەوە. دەبوایە بیر لە پێغەمبەرەکانی بایبلیش بکەمەوە. لەکۆزە مەڕی سدێ بۆکردا، ئەز بەرزترین نمایشی گیانی مرۆڤایەتیم بینی."

ئـو نـو[51] U Nu سـەرۆکی حکـوومەتی بیرمـا Birma، سـەردانێکی بنگوریـۆنی کرد. وڵاتەکەی هـەر وەک ئیسـرائیل لـە چنگی ئینگلیزەکـان ڕزگاری ببوو. ئینگلیزەکان لە بیرمادا سێسەد ساڵ دەسەڵاتدار بوون و لە ئیسرائیلیش سی ساڵان. مانگێک بەر لەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان نەخشەی دابەشکردن بپەژرێنن، کە بە هۆیەوە ئیسرائیل سەربەخۆ ببێ، لە لەندەن ڕێککەوتنی سەربەخۆیی بیرما واژۆ کرا. چوار مانگ بەر لە ئیسرائیل بیرما تەواوی مافەکانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی وەرگرتەوە و بووە پەنجا و هەشتەمین ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئیسرائیلیش پەنجا و نۆهەمین ئەندام. دەسەڵاتەکانی سەرۆک لە بیرمادا دەقاودەق وەک ئیسرائیل سنووردار بوون. لە هەر دوو دەوڵەتەکەدا ڕابەرایەتی بۆ سەرەک وەزیران دەگەڕایەوە. ئونو وەک بنگوریۆن بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سەرەک وەزیران بوو.

هەر دووک پیاوەکـان لـەکاتی پیاسـەیان بـەناو گۆڕەپانی کیبوتەکـەدا، ئەزموونەکانی خۆیان لەگەڵ یەکدا بەراورد دەکرد.

یـەک دوو نـەمامی ئیکـالوپتیس چانـدرابوون، بنگوریـۆن بـە شـانازیەوە نیشانی میوانەکەی دان.

ئونوش بە خەندەوە گوتی:

- "لـە بیرمـا دارودرەختـی زۆرمـان هەیـە. زۆر هـەبوون خراپتـرە لـەوەی کـە زۆر کـەمت هـەبێ. جـەنابی بنگوریـۆن، گـەر مـن لـە جێگەی تۆ بم، ئەوا تا زووە نەمامەکە لە خاک دەردەکێشم."

بنگوریون بەربەستەکانیشی نیشاندان کە بۆ گرتنـەوەی بارانـاو بنیاتیـان نابوون.

ئونو سەرێکی بۆ هەژاند.

- "لـە وڵاتـی مـن ناخۆشـیمان لەگـەڵ ئـاودا هەیـە. لـەوێ دژی دەوەستینەوە. کەچی لێرە دەبێ شەڕی لەسەر بکەن."

ئـەوان گەڕانـەوە خـانووە ڕەنـگ زەردەکـە و بـە قـووڵی لـەگژ باسوخواسیان ڕاچوون.

بنگوریـۆن بـەو میوانـە دڵخـۆش بـوو، دەرفـەتێک بـوو باسـی ئـۆل و فەلسـەفە لەگـەڵ کەسـێکدا بکـا، کـە لـە وڵاتێکی سـەر بـە ئـایینی بـوداوە

[51] U Nu (١٩٠٧-١٩٩٥) یەکەمین سەرەوەزیری بیرمای سەربەخۆ- وەرگێڕ

هاتووە. بنگۆریۆن خوازیاربوو بیردۆزەکەی بۆ شی بکاتەوە بەوەی ئیسرائل، هیندستان و ولاتی گریک (یۆنان) سێ ناوەندی کلتووری گەورەی دێرینەن کە بەهایەکی نەمرانەیان بەخشیوەتە مرۆڤایەتی.

بە میوانەکەی گوت: "من هەمیشە بودام بە یەکێ لە دە بیچمە مێژووییەکاندا داناوە."

بە یەکەوە دەربارەی خاڵە یەکانگیرییەکانی بودایی و دە ڕێنماییە ڕێڕەوشتەکانی موسا دوان.

دەربارەی شارستانێتی کۆن و نوێ دوان. سەبارەت بە ئەرکی لێکۆڵینەوەی زانستییانە بنگوریۆن گوتی: "لە مێژە زانست بە دوای ڕازی سروشتدا وێڵە، ئەو ناتوانێ مرۆڤ فێری ئەوە بکا، کامە ڕێگە هەڵبژێرن."

ئونوی سەرەک وەزیران مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی بنگۆریۆن نیکایاس[52] Nikayas بخوێنێتەوە.

هەروەها سەبارەت باوەڕی ئونو بە دۆناودۆن (Reincarnation) کە لێبڕاوانە باوەڕی وابوو مرۆ لەژیاندا زیاتر گەشە دەکا و بەرەو پێشەوە دەڕوا، سەرەتا بە پلەی پیرۆزدا تێدەپەڕێ ، تا ل لەدواییدا تەنانەت دەبێتە خودی بوداش.

بەو سەردانە بنگۆریۆن دنەدرا لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر دیین و فەلسەفەی ڕۆژهەلاتیدا بکا، پەیوەندیەکی توندوتۆڵی ئابووری لەنێو ئەو دوو ولاتە لەیەک دوورەدا پەیدابوو. دواتر بنگۆریۆن بە خۆشییەوە یادی ئەو سەردانەی دەکردەوە. لە ساڵڕۆژی هەشتەمی سەربەخۆیی بیرمادا ئەو بروسکەی خوارەوەی بۆ ئونو لێدا:

- "ئەو سەردانە لەبیرنەکراوەت کە ئەو زێدەمافەی دایە من باشتر بتناسم، بەردەوام لە یادەوەرییمدا دەمێنێتەوە... من دەرسێکی تایبەتیانەی بودایزمت لێ فێربووم، زۆر بەرزی هەڵدەسەنگێنم و خوێندنەوەی نیکایاسیش جۆشوخرۆشێکی ئازادانەی پێبەخشیم."

لە سدێ بۆکردا بنگۆریۆن بە سەدان هەزار وشەی نووسین. وتاری بۆ ڕۆژنامە جۆربەجۆرەکانی ئیسرائیل هەروەها بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا، خواروی ئەفریقا و ولاتەکانی دیکەش دەنووسی.

---

[52] Nikayas: کوکراوەی نووسراوەکانی شانزە فێرگەکانی کونی بودایزم-وەرگێڕ

بەرچاوترین بەرهەمی کتێبێک بو بەناوی The Rebrith and Destiny of Israel؛ کە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی دوان و وتارە پەخشانەکانی نێوان ١٩٥١ و ١٩٥٢دا. کتێبێکی قەبارەی ٥٨٩ لاپەڕەی لێدەرچوو، لە هەمان ساڵیشدا لە ولاتە یەکگرتووەکان و ئینگلستاندا چاپ و بڵاو بووەوە.

ئەو دەربارەی بابەتە جۆربەجۆرە گرنگەکانی دەنووسی. دەربارەی پاشەڕۆژ گوتی: "ئێمە لە ئێوارەی ڕۆژگارێک داین، کە سوود لە وزەی ڕۆژ وەردەگرێ. لێرە لە نەقەبدا کۆگایەکەی بێ سنوورمان هەیە. ئێمە دەتوانین ئاوی دەریا بپاڵێوین و بەرەو نەقەبی پاڵ بدەین، ئیدی ئەوێ بە چەشنێکی دیکە دەبینرێ لەوەی کە ئێستا هەیە."

ئەو ڕووی دەمی لە کەرتی پەروەردەی ئیسرائیل کرد و ئامۆژگاری ئەوەی کردن کە لە ساڵێکدا ڕۆژێک بۆ سوپا تەرخان بکەن و لەگەڵیاندا بژین، ڕۆژێکیش بۆ گوندەکانی سەرسنوور و ڕۆژێکیش بۆ کیبۆتەکانی نەقەب.

بۆ گۆڤارێکیش کە تایبەت بوو بە نووسینی کلاسیک پەخشانێکی دەربارەی ئەفلاتون نووسی.

لە وتارێکی دیکەیدا گەڕایەوە بێ کەوڵی سۆشیالیستێکی هەڵمەتبەر: "کەم نین ئەوانەی ئەو بیرۆکەیان هەیە، گوایە دەستپێشخەریە تایبەتییەکان (مەبەست لە پولپەرستییە) هەموو گرفتێک چارەسەر دەکا و دەیانەوێ ئایندە لە سەر بنەماکانی دەستپێشخەری تاکیانە بنیاتبنێن. بەڵام ئەو جۆرە کەسانە دەوڵەت و نەتەوە بەرەو هەڵدێر دەبەن. تەنها پولپەرستی مرۆ بەلای زۆریەوە دامەزراندنی قەرتاجەیەکی عیبریانەی لێدەکەوێتەوە و ئەویش وەک قەرتاجەی کەنعانییەکەیان زۆر خۆی ناگرێ.

- "لەبەرئەوەی قەرتاجە لەسەر گۆی زەویش نەما، چونکە لەپشت هانیبالەوە تەنها شارێکی پڕ بازرگان و سەوداکارانی پول و پارە هەبوو کە دەستپێشخەرییە تایبەتیەکانی خۆیان وەک خودا تەماشا دەکرد و بەرانبەرەکانیشیان گەلی جوتیار بوون، بەتوندی بە خاکەوە بەسترابوونەوە.

- "دەستپێشخەری تایبەتییانە نابێتە مایەی یەکگرتنەوەی کەسانی دیاسپۆرا، نابێتە مایەی بوژاندنەوەی بیابان، نابێتە مایەی ئافراندنی شارستانێتی عیبرییانە کە شیاوی گەلی کتێبەکە بێ و هەروەها هەرگیز ناشبێتە هۆی پێگەیاندنی جڤاکێکی نوێ."

هەفتەیەکی دیکە بنگوریۆن شلتری نواند و نووسی؛ با لە هەموو لایەکی ئیسرائیل هەرەوەزی، هاوکاری و کشتیاری تایبەت پەیدابێن، ئەوسا هەر کۆلۆنیستێک بە خۆی سەرپشک بێ ئاخۆ چ جۆرە سیستمە ئابوورییکی پێ باشترە.

بنگوریۆن دروشمی "دەی بەرەو ئیلات"ی بەخشیە گەنجان، بەڵام کاتێک تەماشای ئاسۆی بکردبایە هاتوچۆیەکی کەمی لەسەر ڕێگای بیئیر سەبعە بەلاپاڵی سدێ بۆکر بەرەو باشوور دەدی. هیچ کۆرەوێک لە شارە گەورەکانەوە نەهات، کۆمەڵە و دەستەی زۆری کۆمەڵانی خەڵک شوێنپێیان هەڵنەگرت، دانیشتوانی کیبوتەکان و سەرسنوورەکان بەرێژەیەکی بەرچاو زیادیان نەکرد، بای حەزی کشان بەرەو باشوور هەڵینەکرد.

هەڵبەت بنگوریۆنیش بە تەواوی شکستی نەهێنا. لە ١٩٥٤دا هەموو دانیشتوانی ئیسرائیلی لە بیابان ئاگادار کردەوە، لەو ئەگەرانەی لەوێ هەن، لە خاکەکەی کە ناوچەکە لە ئایندەدا چ ڕۆڵێک دەبینێ.

لە تەلئەبیبدا پێڵاودروستکەرێکی سادەی رەچەڵەک پۆلۆنی بەناوی باروخ تالBaruch Tal بیچمە هەرە لەپیشەکەی ماپای خۆشدەویست.

پرسی: "ئەرێ دەکرێ ژمارەی پێوانی پێی بەرێزیان بزانم چەندە؟"

کاتێک تال پرسەکەی کرد، ڕوونیشی کردەوە:

- "زۆر جار بیردەکەمەوە کە ئەو لە بیاباندا دەژی. دەڵێن لەو دەمەی ساڵەدا بیابان بە شەوان ساردە. من ئەو لە خۆمدا دەبینمەوە کە چ ئازارێک دەچێژێ. ئاخر چیدی شەنگ و بڕستی لاویتی نەماوە. ئەو لەمن بە تەمەنترە. بەڵام ئەو لەوێ کێماسی لە زۆر شتدا هەیە، کەچی من لێرە وەک هەڤاڵێکی ئاسایی لە هەموو خۆشیەکی تەلئەبیب سوودمەندم. خۆ دەبینی، لەبەرئەوە من جووتە پێڵاوێکی بۆ دروست دەکەم. ئیدی با چیدی ویژدانم ئازارم نەدا."

## بەشی ٢٤

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٥دا وەزیری کار، گۆڵدا میرسۆن (مایەر) سەردانێکی سدێ بۆکری کرد تا لەگەڵ بنگۆریۆندا دەربارەی ئەو ئاستەنگانەی هاتونەتە ڕێی هاوکارەکانی بۆ پێکهێنانی کابینەی حکوومەت بدوێ. بانگهێشتنامەیەکی سەرەک وەزیران شارێتیشی سەبارەت بەگەڕانەوەی بۆ ژیانی گشتی بۆ هێنابوو بۆئەوەی سەرلەنوێببێتەوە وەزیری بەرگری و بێتەوە ناو حکوومەت و هاوکاریان بکا تا لە قەیرانەکە دەردەچن، چونکە هەڵبژاردن لە هاویندا لەگۆڕێدابوو.

سێ ڕۆژ دواتر شارێت ڕایگەیاند، بنگۆریۆن داواکەی پەژراندووە. ڕۆژی پاشتر پیاوە سەر و ڕیش سپییەکە بیابانی بەجێهێشت، لە ئۆرشەلیم بە خۆی و جلی سەربازییانە سەری دەرهێنایەوە و جارێکی دیکە بۆ پایەی وەزیریەکەی سوێند درایەوە.

دەسەڵات بەجێهێشتنەکەی چاوەڕواننەکراو بوو بە تەواویش بڕایەوە. هاتنەوەکەشی بۆ ناو بازنەی ژیانی سیاسی پێواژۆیەکی پلەدارییانە بوو.

ئەوەندە هۆ هەبوون کە سدێ بۆکر بەجێبێڵی هەروەک چۆن پێش چواردە مانگ هەمان هۆ بۆ بەجێهێڵانی ئۆرشەلیم و تەلئەبیب لەگۆڕێدابوون.

ژیانی بیابان بۆ جەستەی ئەو و خێزانەکەی قورس بوو. جارێکیان لەپڕ ژانێکی تیژ دایگرت و بە پەلە پاولای خێزانی بە ڕادیۆ داوای ترومبێلی فریادڕەسی کرد، کاتێکیش ئەمبیولانسەکە گەیشت، ژانەکەی شکابوو، لەگەڵیان نەچوو. بەڵام زۆر جاران ژانی پشتێشەی هەبوو، پاولاش

لەبەر دەردی باداری دەیناڵاند؛ بۆیان ئەستەم بوو لەوێ بەردوام بن چونکە ئەوان نەیاندەویست لێیپاڵدەنەوە و بێ ئیش بوەستن.
لە سدێ بۆکردا زۆر کاتی خوێندنەوەی بە دەستەوە نەبوو وەک ئەوەی چاوەڕوان دەکرا. سەرباری ئیشە فەرمییەکەی لە تەلئەبیب و ئۆرشەلیمدا کاتی زۆرتری بۆ خوێندنەوەی کتێبەکانی هەبوو. سەرەڕای ئەوەش مەبەستەکەی لە چوونە بیابان کە لە بنەڕەتدا هێمایەک بوو، پێکای. سەرنج و ئاگاهی زۆری بۆ لای نەقەب ڕاکێشا، ئەو دەرفەتەی هەبوو بێتەوە سەرخۆی و ساڵێک بێ تەنگەتاوکردنی کاروبارەکانی حکوومەت لە بیاباندا بەسەر ببا.
هەڵبەت نەیدەویست پەیوەندییەکانی لەگەڵ سدێ بۆکردا بپچڕێنێ. لەگەڵ دەستەی بەڕێوبەرایەتی ئەوێ وا ڕێککەوت، کە کوڵێتە ڕەنگزەردەکەی هەر بمێنێتەوە. زۆر لە کتێبەکانی لەوێ بەجێهێشتن و بە خۆی و پاولاش بەڵێنیان دا کە زۆر جاران بۆی بگەڕێنەوە.
بۆ بەرزڕاگرتنی ئەو چوارده مانگەی لەوێ بەسەری بردن، دوو وشتری پێشکەش بە جڤاکەکەی ئەوێی کردن، تا بۆ شوانێتی پەزەکانیان سوودییان لێوەربگرن.
لە یەکێک لە دوانە یەکەمەکانی دوای گەڕانەوەیدا، ئەوەی ئاشکرای کرد، لە بیاباندا هیچ ڕاستیەکی دیکەی نەدۆزیوەتەوە، بەڵام هەموو شتەکانی تیژتر دەبینین.

- "لێمگەڕێن با پوختەیەکتان دەربارەی ئەوەی لەوێ بینیم، بۆتان باس بکەم: لە شارەکاندا خەڵکێکی زۆر بە چڕی لەتەک یەکدا دەژین؛ ناوچە سەرسنووریەکان وەک پێویست نەکراونەتە نشینگە.
- "لە شاردا زۆر هەوڵ بۆ خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی دەدرێ؛ کێماسیان لە کاری بەرهەمدار و دەستپێشکەرییدا هەیە.
- "شەڕ و دەمەقاڵێ زۆر دەکرێ؛ هەستی بەرپرسیارێتی کەمە و گیانی هاوکاری و زبارەییش (هەرەوەزییانە) کەمتر.
- "زۆر قسەی بێ ناوەڕۆک دەربارەی هاوڕێیایەتی و یەکێتی جوولەکایەتی دەکرێ؛ یارمەتی پێویستی کۆچبەرە نوێکان نادرێ.

- "زۆر بازرگـان و خزمـەتکاری گرێگرتـەی مـاڵان هـەن؛ کـەمتر کاری بەرهەمهێنن.
- "داوای گـەورە لـە حکوومـەت و داوای بچـووک لـە خـەڵک خـۆی دەکرێ.
- "زۆر پـێ لەسـەر زێدەمافـدا دادەگیـرێ، کـەمتر مکـوڕن لەسـەر بەدیهێنانی بەڵێنەکان."

هەنووکە دەوڵەتەکـە تەمـەنی بۆتـە شـەش سـاڵان، سـەرهێڵی نـوێی بـۆ گەلەکەی ڕوون کردنەوە:

- "پێوەرەکـان دەبـێ فێـری ئـەوەمان بکـەن، چـۆن بەرپرسـیارێتی هەڵبگرین. ئێمە دەبێ فێربین لێهاتووانە کار بکەین. دەبێ ئاستی پێوانەیی ژیانی خۆمان بە تـەکانی پەرەسـەندنەوە بەرەوپێشـەوە بەرین، زیاتر پاڵ بە کۆمەکی دەرەوە نەدەینەوە. ئێمە دەبێ بەبێ بەرانـبەر گەنجـەکانمان پـەروەردە بکـەین، نـەوەک هـەر بـۆ قوتابخانە سەرەتاییەکان بەڵکو ناوەندی و بەرزتریش.
- "ئێمـە دەبـێ مەڵبەنـدی لێکۆڵینـەوەی زانسـتی دابمـەزرێنین و باشترین زانای جوولەکەی بۆ ڕابکێشین.
- "ئێمە دەبێ ئاو بگەیەنینە بیابان. دەبێ سـوود لـە هەمـوو دڵۆپە باراناوێک وەربگرین و کـۆی بکەینـەوە. دەبێ چۆڵستانی بیابان بە بەهەشتی عەدەن بگۆڕین. دەبێ کۆڵێت و خانووە کۆنـەکانمان بـڕوخێنین، هەمـوو هاوڵاتییـەک بـە ئاسـتێکی شایسـتە موچـە، نیشتاک و متمانەی ئابورییانەی تا لە ژیاندا ماوە پێببەخشین.
- "ئێمە دەبێ لێرەدا نموونەیەکی شەرمەشقی جیهان بین و ڕاستی گـەلی بـژاردە بەرجەسـتە بکـەین، دەبـێ خـەونی پێغەمبـەرە دێرینەکانمان بەدی بێنین.."

لـە نێـو میوانـە زۆرەکـانی ئـەو هاوینـەدا خـانم فـرانکلین دیلانـۆ ڕۆزهڤێلـتFranklin Delano Rooseveelt بـوو. بنگۆریـۆن لـە خانووەکەی کێرن کیامەتدا پێشوازی لێکرد. جددییانە لەسـەر سیاسـەتی جیهان و پرسـگەلی ڕۆژهـەڵاتی ناوین دوان. لەگەڵ یەکدا باش هـەڵیان دەکرد. خانم ڕۆزەڤێلت دواتر لـە وتارەکانیدا بـە "پیاوە نایابەکە کە من

پێوەی کارانگاز بووم" ناوی برد و بنگۆریۆنیش بە شەوقەوە دەربارەی خانمەکە دوا.

بنگۆریۆن دەربارەی سدێ بۆکر قسەی بۆ کرد، کە چوارده مانگان لە وێی بەسەربردووە، ئەو ماوەیەشی بەختیارترین قۆناخی ژیانی بووە.

خـانم رۆزڤیلـت تێبینـی ئـەوەی دا: "هاوسـەرەکەم پێیوایـە بـەردە رووتەنەکانی هەندێ شوێنی ئیسرائیل هاندەری کشتیاریی نین."

بنگۆریۆن بە خەندەوە وەڵامی دایەوە:

- "ئەوە ڕاستە کە یەزدان هەموو بەردەکانی بە گڵ دانەپۆشیون، وەلـێ هـەر لەبـەر ئـەوە وایکـردووە، کـە ئەوەنـدەی بـە ئێمـە بەخشیوە بیخەینەگەڕ."

خانم ڕۆزڤێلت ئەو سەرنجەی بە هێمای پیاوێک دانا کە زۆر لەبن ڕاژەی بیرۆکە نموونەییەکانی خۆیدا بێ.

لە هاوینەکەدا بنگۆریۆن، پاولا و ئارگۆڤ بە ترومبێل یەک دوو ڕۆژ چونە سەر گۆلی تەبەریا. کاتێکیش خەریک بوون بە بناری شاخی تابوور ڕەت دەبوون، وەزیری بەرگری گوتی:

- "نەحێمیا، ئێمە ڕۆژێک دەمێنینەوە دەبێ مشووری پەیداکردنی ئەسپێکم بۆ بخۆی، تاکو بە سوارییەوە بەسەر چیاکە بکەوم."

دەمودەست پاولا ناڕازی بوو.

لەوێ ڕێگایەکی باشی ترومبێل هەبوو. لەوەش بترازێ تەمەنی ئەو هی ئەسپسواری نەبوو.

بنگۆریۆن لە وەڵامدا گوتی: "وانییە پاولا، من بەر لە چل ساڵ بەسەر ئەو شاخەدا بە سواری ئەسپ چوومەتە ئۆرشەلیم، دەزانی ئەو ماوەیە چەند دوورە."

پاولا خێرا بەرسڤی دایەوە: "بەڵێ، بەڵام چل ساڵ لەمەوبەر، ئەو کات تۆ هێشتا لاوێکی بیست و هەشت ساڵان بووی. ئەمەت لەبیرنەچێ هەنووکە بوویتە شەست و هەشت!"

مێردەکەی هۆشدارینامەکەی خێزانەکەی فەرامۆش کرد و فەرمانی بە ئارگۆڤ دا ئەسپێکی بۆ پەیدا بکا.

پاولا بەسەرزەنشتکردنەوە: "خۆ ناوێری وا بکەی!"

